ناوەڕۆك (Contents)

بابەت پەڕەی

**پێشەکی:**

**پێشەکی سوپاسی خوای گەورە ومیهرەبان دەکەم کە یارمەتی دام بۆ ئامادەکردنی ئەم بەرهەمە، ودروود وسڵاو لە پێغەمبەری ئازیز وخۆشەویستم (محمد) د.خ .**

**پێشەکی یاری تۆپی پێ یارییەکی میللی جیهانییە و زۆربەی خەڵکی تامەزرۆی ئەم جۆرە یارییەن گەر بە یاری کردن بێت یان بە سەیر کردنی بێت، خۆشی یاری تۆپی پێی لە زۆر لایەنەوە سەیر دەکرێت لەوانە لە گۆڵ کردن کە گۆڵێ لە گۆڵێکی تر جیاوازە وچۆنێتی بەڕێوەبردنی یارییەکە...هتد، بۆیە خۆشی یاری پابەند بوونە بە یاساکانەوە.**

**لەم دە ساڵەی دواییدا یاری تۆپی پێ گۆڕانکارییەکی زۆری بەخۆوە بینیوە لە ڕووی تەکتیکی تیپەکان لە کاتی یاری وهەروەها تیپەکان ویاریزانان هەڵدەستن لە سەرپێچی کردن لە یاسای یارییەکە بە تەکتیکێك کە فێڵ لە یاسا بکەن، بۆیە یەکێتی تۆپی پێ ی نێودەوڵەتی و ئەنجومەنی یاسادانانی نێودەوڵەتی (بۆرد) هەڵسان بە گۆڕانکارییەکی زۆر لە هەموو بەندەکانی یاسای تۆپی پێ جگە لە بەندی 2 نەبێت کە (تۆپ)ە بۆ ئەوەی دادپەروەری وسەلامەتی وتام وچێژی یاری خۆشتر بکات. وبە تایبەتی ڕوحی یارییەکە بۆتە خاڵێکی گرنگ بۆ بەڕێوەبردنی یاری.**

**جوانی یاری تۆپی پێ لە وەدایە کە یاسا تیایدا سەروەرە تا ئەندازەیەکی باش یەکسانی مافەکان لەپێش چاودەگێڕێ بۆیە پێویستە داوەران وکەسانی پسپۆڕ لەم بوارەدا بە بەردەوامی وە بێ پچڕان ئاگاداری دواهەمین گۆڕانکارییەکان بن.**

**بۆیە خوازیارم کە توانیبێتم کتێبخانەی کوردی دەوڵەمەند بکەم بەم کتێبە کە یاساکانی تۆپی پێی نێودەوڵەتیە وڕەزامەندی یەکێتیی ناوەندی تۆپی پێی نێودەوڵەتی لێ وەرگیراوە بۆ وەرگێڕانی بۆ زمانی کوردی وعەرەبی.**

**هاوکار سالار احمد**

**مامۆستا - ناوبژیوان**

**زانکۆی سلێمانی – سکوڵی پەروەردەی وەرزش**

# IFAB & FIFA Permission

IFAB Permission:

Dear Hawkar,

Many thanks for your enquiry.

I am pleased to confirm that you are permitted to translate the Laws of the Game of Football into Arabic and Kurdish.

Many thanks and kind regards
Lukas

Lukas Brud
IFAB Secretary

---

FIFA Permission:

Dear Mr .Ahmed,

Thank you for your enquiry.

We are pleased to inform you that FIFA allows the Laws of the Game to be reproduced only under the following conditions:

- permission is restricted to the current version of the Laws of the Game
- reference must be made to the source and copyright
- mention must be made that all the rights are reserved by FIFA
- mention must be made that they are the official laws of the International Football Association Board
- the use of the reproduced text and imagery is solely editorial , and not commercial

Given that the publication will serve to promote football and provided that you meet the above-mentioned criteria , no fees for copyright will be charged.

We trust this information will be of use to you.

Yours sincerely,

## تێبینی لە سەر بەندەكانی یاسای یاری (Notes on the laws of the game):

### گۆڕانكارییەكان (Modifications):

**گۆڕانكارییەكان**

**مەرجە ڕەزامەندی یەكێتی نیشتیمانی ئەو وڵاتە لە سەر هەر گۆڕانكارییەك وەربگیرێت بە مەرجێ پارێزگاری لە بنەمای یاساكانی تۆپی پێ بكات، دەتوانرێت گۆڕانكاری لە یاساكان بكرێت لە یارییەكانی ژێر تەمەنی (16) ساڵدا یان یاری تایبەت بە ژنان، یاخود گەورەپیاوان (لە سەروی 35 ساڵەوە) یان بۆ یاریزانە خاوەن پێداویستیە تایبەتییەكان لە هەر یان لە هەموو ئەم خاڵانەی لای خوارەوە:**

- **قەبارەی یاریگا.**
- **كێش و قەبارەی تۆپ یان ئەو مادەیەی لێی دروستكراوە.**
- **ماوەی نێوان گۆڵەكان و بەرزی ڕاجەكە لە زەوی.**
- **كات وماوەی تایمەكانی یاری.**
- **ئاڵوگۆڕین.**

**بۆ هەر گۆڕانكاریەكی تر دەبێت ڕەزامەندی ئەنجومەنی یاسادانانی نێودەوڵەتی (بۆرد)ی لێ وەربگیرێت.**

### زمانە فەرمییەكان (Official languages):

**ئەنجومەنی یاسادانانی نێودەوڵەتی (بۆرد) یاساكانی تۆپی پێ بڵاودەكاتەوە بە زمانی ئینگلیزی وفەرەنسی وئەڵمانی وئیسپانی. وئەگەر هاتوو تێنەگەیشتنێك هەبوو لە ووشەكە، ئەوا نووسینی ئینگلیزی باوەرپێكراو دەبێت (پشت دەبەسترێت بە دەقی ئینگلیزی).**

### كلیلی ڕوونكردنەوەی هێماكان (Key):

**گۆڕانكارییە سەرەكیەكان لە یاسای تۆپی پێ هێڵێ بە ژێریدا هێنراوە و دیاریكراوە لە پەراوێزدا.**

**گۆڕانكارییە سەرەكیەكان لە یاسای تۆپی پێ بە ڕەنگی سەوز و لە پەراوێزدا دیاریكراوە.**

## بەندی (1) یاریگا (The Field of Play):

### 1. ڕووکەشی یاریگا (Field surface):

دەبێت ڕووکەشی یاریگا بە تەواوەتی سروشتی یان بە تەواوەتی دەستکرد بێت (ئەگەر ڕێسای پاڵەوانێتیەکە ڕێگەی دا) جگە لەوەی ئەگەر ڕێسای پاڵەوانێتیەکە ڕێگەی دا بە لێکدانی ماددەی تێکەڵ لە چیمەنی سروشتی و دەستکرد (سیستەمی دووڕەگ).

دەبێت ڕەنگی ڕووکەشی یاریگای دەستکرد سەوز بێت.

لەکاتی بەکارهێنانی چیمەنی دەستکرد لە پاڵەوانێتی نێوان ئەو تیپانەی کە سەر بە یەکێتی ناوەندی تۆپی پێ ی نێودەولەتین یان پاڵەوانێتی نێودەوڵەتی یانەکان، ئەوا پێویستە خاسیەتی ڕووکەشی یاریگا لە خاسیەتەکانی پرۆگرامی جۆری فیفا لە ڕووی جۆری چیمەنی تۆپی پێ ی (1) یان ستانداردی یاری نێودەولەی بچێت، مەگەر بە پێچەوانەوە ئەنجومەنی یاسادانانی نێودەوڵەتی بۆرد لێبوردنی تایبەتی بدات لەو بارییەوە.

### 2. هێڵکاری یاریگا (Field markings):

یاریگا دەبێت لاکێشە بێت و دیاری بکرێت بە چەند هێڵێکی بەردەوام (بچڕ بچڕ نەبێت) ومەترسیدار نەبێت: دەتوانرێت ماددەی چیمەنی دەستکرد بەکاربهێنرێت بۆ نیشانکردن وهێڵکاری لەسەر یاریگای چیمەنی سروشتی ئەگەر مەترسیدار نەبێت. وئەو هێڵانە دەبنە بەشێك لە ڕووبەری ئەو یاریگایە.

تەنها ئەو هێڵانەی کە لە بەندی (1)دا ئاماژەی پێکراوە دەتوانرێت نیشانە بکرێت لە سەر یاریگادا.

هەردوو هێڵە درێژەکان پێیان دەوترێت هێڵی تەنیشت، و هەردوو هێڵە کوورتەکان پێیان دەوترێت هێڵی گۆڵ.

هێڵی ناوەڕاست یاریگا دەکاتە دوو بەشەوە، و هەر ئەو هێڵە، هێڵی ناوەڕاست دەگەیەنێت بە هەردوو هێڵی تەنیشت.

نیشانەی ناوەندی یاریگا دیاری دەکرێت لە خاڵی بەیەك گەیشتنی هێڵی ناوەڕاست. وبازنەیەك دروست دەکرێت لە دەورووبەری کە نیوە تیرەکەی 9.15 م (10 یاردە).

دەتوانرێت نیشانەیەك لە دەرەوەی یاریگا لە دووری 9.15 م (10یاردە) لە کەوانەی ناوچەی گۆشەوە دابنرێت بە گۆشەیەکی وەستاو لە سەر هەردوو هێڵی گۆڵ و هەردوو هێڵی تەنیشت.

دەبێت پانی هەموو هێڵەکان وەکو یەك بن، وپانی ئەو هێڵانە نابێت لە 12سم (5 بۆصە) زیاتر بێت. پانی هێڵی گۆڵ دەبێت بەهەمان پانی دوو ئەستوونی گۆڵ و ڕاجەکە بێت.

کاتێ چیمەنی دەستکرد بەکاردەهێنرێت، ئەوا ڕێگە دەدرێت بە دانانی هێڵی تر بە مەرجێ ڕەنگێکی جیاواز و ڕوون وئاشکرای هەبێت کە بتوانرێت جیا بکرێتەوە لەو هێڵانەی کە بەکاردەهێنرێت لە یاری تۆپی پێ.

ئەو یاریزانەی کە هەڵدەستێت بە دانانی نیشانەی ڕێ پێنەدراو لە سەر زەوی یاریگا ئەوا دەبێت ئاگاداربکرێتەوە (بە کارتی زەرد) لە بەر ڕەفتاری ناوەرزشی. ئەگەر داوەر ئەم کارەی بینی لە کاتی یاری ئەوا دەبێت ئەو یاریزانە سەرپێچیکارە ئاگادار بکاتەوە (بە کارتی زەرد) لە سەر ڕەفتاری ناوەرزشیانە کاتێ تۆپی داهاتوو دەچێتە دەرەوەی یاری.

---

(1) چیمەنی تۆپی پێ (Football Turf):
https://football-technology.fifa.com/media/1026/fifa_quality_programme_for_football_turf.pdf

### 3. چێوەکان (Dimensions):

دەبێت هێڵی تەنیشت درێژتر بێت لە هێڵی گۆڵ.

| | | |
|---|---|---|
| درێژی (هێڵی تەنیشت): | کەمترین ماوە | 90 م (100 یاردە) |
| | درێژترین ماوە | 120 م (130 یاردە) |
| پانی (هێڵی گۆڵ) | کەمترین ماوە | 45 م (50 یاردە) |
| | درێژترین ماوە | 90 م (100 یاردە) |

### 4. لە یارییە نێودەوڵەتییەکاندا (International matches):

| | | |
|---|---|---|
| درێژی (هێڵی تەنیشت): | کەمترین ماوە | 100 م (110 یاردە) |
| | درێژترین ماوە | 110 م (120 یاردە) |
| پانی (هێڵی گۆڵ) | کەمترین ماوە | 64 م (70 یاردە) |
| | درێژترین ماوە | 75 م (80 یاردە) |

پاڵەوانێتییەکان دەتوانن درێژی هێڵی گۆڵ وهێڵی تەنیشت دیاری بکەن بەپێی ئەو چێوە وپێوانەی سەرەوە.




- پێوانەی بەشی دەرەوەی هێڵەکان بەشێکن لە ڕووبەری ئەو ناوچەی کە دیاربکراوە.
- خاڵی سزا دیاری دەکرێت لە سەنتەری نیشانەی سزا بۆ قەراغی دواوەی هێڵی گۆڵ.

### 5. ناوچەی گۆڵ (The goal area)؛

**دوو هێڵ بە شێوەی ئاسۆیی لەسەر هێڵی گۆڵ دادەنرێت لە دووری 5.5 م (6 یاردە) لە بەشی ناوەوەی هەردوو ئەستوونی گۆڵەكە. ئەم دوو هێڵە درێژ دەكرێنەوە بۆ نێو یاریگا ماوەی 5.5 م (6 یاردە) و بە یەكتر دەگەیەنرێت بە هێڵێكی تەریب لەگەڵ هێڵی گۆڵ. ئەو ناوچەیەی سنوور كراوە بەم هێڵانە و هێڵی گۆڵ پێدەوترێت ناوچەی گۆڵ.**

### 6. ناوچەی سزا (The penalty area)؛

**دوو هێڵ بە شێوەی ئاسۆیی لەسەر هێڵی گۆڵ دادەنرێت لە دووری 16.5م (18یاردە) لە بەشی ناوەوەی هەردوو ئەستوونی گۆڵەكە. ئەم دوو هێڵە درێژ دەكرێنەوە بۆ نێو یاریگا ماوەی 16.5م (18یاردە) و بە یەكتر دەگەیەنرێت بە هێڵێكی تەریب لەگەڵ هێڵی گۆڵ. ئەو ناوچەیەی سنوور كراوە بەم هێڵانە و هێڵی گۆڵ پێدەوترێت ناوچەی سزا.**

**لەناو هەر ناوچەیەكی سزا نیشانەی سزا دادەنرێت لە دووری 11 م (12 یاردە) لە خاڵی ناوەڕاستی هەردوو ئەستوونی گۆڵەكە.**

**بازنەیەك كە نیوە تیرەكەی 9.15 م (10 یاردە) دروست دەكرێت لە ناوەڕاستی نیشانەی سزا و ڕادەكێشرێت بۆ دەرەوەی ناوچەی سزا.**

### 7. ناوچەی گۆشە (كۆرنە) (The corner area)؛

**وێنەی چارەكە بازنەیەك كە نیوە تیرەكەی 1م (1 یاردە) دروست دەكرێت لە هەر گۆشەیەك بۆ ناو یاریگا.**




### 8. وەستاوەكانی ئاڵای گۆشە (Flagposts) :

**وەستاوەكانی ئاڵای گۆشە دەبێت بەرزی لە 1.5م (5 پێ) كەمتر نەبێت ونابێت سەری وەستاوەكان تیژ بێت، وەستاوەكانی ئاڵای گۆشە دەبێت لە هەر گۆشەیەك دابنرێت.**

**دەكرێت وەستاوی ئاڵا لە كۆتایی هێڵی ناوەڕاست دابنرێت لە دووری 1م (1 یاردە) لە دەرەوەی هێڵی تەنیشت.**

### 9. ناوچەی هونەری (The technical area)؛

**ناوچەی هونەری بەندە بەو یارییانەی كە ئەنجام دەدرێت لەو یاریگایانە كە جێگای تایبەتی هەیە بۆ دانیشتنی كارگێڕانی تیپ ویاریزانە یەدەكەكان ویاریزانە گۆڕاوەكان، وەك لە خوارەوە ئاماژەكراوە:**

- **ناوچەی هونەری ماوەی 1 م (1 یاردە) لە ملا و ئەولای شوێنی دانیشتن درێژ دەكرێتەوە هەروەها 1 م (1 یاردە) درێژ دەكرێتەوە بۆ پێشەوەی هێڵی تەنیشت.**
- **پێویستە ناوچەی هونەری بە نیشانە دیاری بكرێت.**
- **دەبێت ڕێسای پاڵەوانێتی ژمارەی ئەو كەسانە دیاری بكات كە ناوچەی هونەری پڕ دەكەنەوە.**
- **ئەو كەسانەی ناوچەی هونەری پڕدەكەنەوە:**

**- دیاریكردنی پێناسەی ئەو كەسانەی كە ناوچەی هونەری پڕدەكەنەوە پێش دەستپێكردنی یاری بەپێی ڕێسای پاڵەوانێتیەكە.**

**- دەبێت بە شێوەیەكی بەرپرسانە هەڵس وكەوت بكەن.**

- پێویستە لە سنووری ناوچەی هونەری خۆیان بمێننەوە تەنها لە هەندێ حاڵەتی تایبەتی نەبێت، بۆ نموونە: ڕێگە دەدرێت بە پزیشك یان چارەسەرکەر کە بچنە نێو یاریگا بۆ هەڵسەنگاندنی باری پێکانی یاریزان ئەوەش بە پرسی داوەر.

- تەنها یەك کەس لەهەر کاتێك دەتوانێت زانیاری تەکتیکی بگەیەنێت بە یاریزانان لە ناوچەی هونەری.

### 10. گۆڵەکان (Goals):

دەبێت هەردوو گۆڵەکە لە ناوەڕاستی هێڵی گۆڵ دابنرێت.

گۆڵ پێك دێت لە دوو ئەستوونی چەقێنراو بە دوورییەکی یەکسان لە وەستانی ئالای گۆشەکان، ولە سەرەوە بە ڕاجەیەك بە شێوەیەکی ئاسۆیی دەبەسترێت. دەبێت هەردوو ئەستوون وڕاجەکە لە ماددەیەکی باوەڕ پێکراو دروست بکرێت ودەبێت گۆڵەکان بە شێوەیەکی چوار گۆشە یان لاکێشە یاخود خڕ یان نیوە خڕ یان هێلکەیی بێت بە جۆرێك مەترسیدار نەبێت.

ماوەی نێوان هەردوو ئەستوونەکە 7.32م (8 یاردە) و بەرزیەکەی لەژێر ڕاجەکەوە بۆ زەوی دەبێت 2.44 م (8پێ) بێت.

پێویستە شوێنی هەردوو ئەستوونی گۆڵ سەبارەت بە هێڵی گۆڵ بەپێی وێنەکان بێت.

دەبێت هەر دوو ئەستوون وڕاجەکە ڕەنگی سپی بێت وهەمان پانی وئەستووری هەبێت کە بریتیە لە 12سم (5 بۆصە).

ئەگەر ڕاجەی گۆڵ کەوتن یان شکا، دەبێت یاری بوەستێت هەتا چاك دەکرێتەوە یان دەگۆڕێت بە گۆڵێکی تر. ئەگەر چاك نەکرا ئەوا یارییەکە هەڵپەسێردراو دەکرێت (تەواوناکرێت). ڕێگە نادرێت پەت یان هەر ماددەیەکی نەرم یان مەترسیدار لە جیاتی ڕاجەکە بەکاربهێنرێت. یاری دەستپێدەکاتەوە بە بەردانەوەی تۆپ.

دەتوانرێت تۆڕ ببەسترێت بە گۆڵەکان وئەرزی پشت گۆڵەکان: دەبێت بەشێوەیەکی باش جێگیر بکرێت ونابێت ڕێگری لە گۆڵپارێز بکات.

#### سەلامەتی (Safety):

دەبێت گۆڵەکان لە زەوی جێگیر بکرێت (گۆڵی گواستنەوەش دەکرێتەوە).



### 11. تەكنۆلۆجیای هێڵی گۆڵ (Goal Line Technology (GLT)):

سیستەمی تەكنۆلۆجیای هێڵی گۆڵ (GLT) بەكاردەهێنرێت بۆ دڵنیا بوون لەوەی كە گۆڵ بووە یان نا، ئەوەش بۆ پشتگیری كردنی بڕیاری داوەرە.

لە كاتی بەكارهێنانی تەكنۆلۆجیای هێڵی گۆڵ (GLT)، ئەوا ڕێگە دەدرێت بە گۆڕانكاری لە چوارچێوەی گۆڵەكان بەپێی ئەو خاسیەتانەی كە ئاماژەی پێكراوە لە پرۆگرامی كوالیتی فیفا بۆ تەكنۆلۆجیای هێڵی گۆڵ وبەپێی یاساكانی تۆپی پێ.
ئەگەر هاتوو تەكنۆلۆجیای هێڵی گۆڵ بەكارهێنرا ئەوا دەبێت ئاماژەی پێكرا بێت لە ڕێسای پاڵەوانێتییەكە.

#### پرنسیپی تەكنۆلۆجیای هێڵی گۆڵ (Principles of GLT):

تەكنۆلۆجیای هێڵی گۆڵ جێبەجێ دەكرێت تەنها بۆ هێڵی گۆڵ وبەكاردەهێنرێت تەنها بۆ دیاریكردنی ئەگەر هاتوو گۆڵ تۆمار كرا.
ئەگەر هاتوو گۆڵ تۆمار كرا ئەوا دەبێت ئاماژە بدات بە گۆڵەكە بۆ داوەرانی یارییەكە دڵنیا بكرێتەوە لەلایەن سیستەمی تەكنۆلۆجیای هێڵی گۆڵ یەكسەر و ئۆتۆماتیكی لە ماوەی یەك چركەدا (لەلایەن كاتژمێری داوەر ئەوەش بە لەرزین و نیشانەیەكی بینراو).

#### خاسیەتەكان و پێویستیەكانی تەكنۆلۆجیای هێڵی گۆڵ (Requirements and specifications of GLT):

ئەگەر تەكنۆلۆجیای هێڵی گۆڵ بەكارهێنرا لە یارییەكانی پاڵەوانێتی، ئەوا دەبێت ڕێكخەری پاڵەوانێتییەكە دڵنیا بێت لەوەی كە ئەو سیستەمە باوەڕپێكراوە بەپێی یەكێ لەم ستانداردانەی خوارەوە:

- پرۆگرامی كوالیتی فیفا (FIFA Quality PRO).
- كوالیتی فیفا (FIFA Quality).
- ستاندەردی یاری نێودەوڵەتی (IMS - INTERNATIONAL MATCH STANDARD).

دەبێت پەیمانگای تاقیكردنەوەی سەربەخۆ هەلسێت بە دڵنیا بوون لە ووردی وكاركردنی ئەو سیستەمە كە ئامادەكراوە بە تەكنۆلۆجیای جیاواز بەپێی نامیلكەی تاقیكردنەوە. ئەگەر تەكنۆلۆجیاكە ئیش نەكات بەپێی نامیلكەی تاقیكردنەوە ئەوا دەبێت داوەر كار بە تەكنۆلۆجیای هێڵی گۆڵ نەكات وپێویستە ئەم كارە ڕاپۆرت بكات بۆ بەرپرسانی پاڵەوانێتیەكە.

كاتێ تەكنۆلۆجیای هێڵی گۆڵ بەكاردەهێنرێت ئەوا دەبێت داوەر كارەكانی ئەو تەكنۆلۆجیایە تاقی بكاتەوە پێش یارییەكە وەك كە ئاماژەی پێكراوە لە پرۆگرامی كوالیتی فیفا سەبارەت بە نامیلكەی تاقیكردنەوەی تەكنۆلۆجیای هێڵی گۆڵ.

### 12. پڕوپاگەندەی بازرگانی (Commercial advertising):

بە هیچ شێوەیەك بواری پڕوپاگەندە نادرێت لە نێو یاریگا بە شێوەیەكی ڕاستەقینە بێت یاخود خەیاڵی، ولە سەر ئەرزی ئەو ناوچەیەی كە كەوتۆتە ناوچەی تۆڕی گۆڵ یان ناوچەی هونەری یان ڕووبەری پێداچوونەوەی داوەر (VAR) یان لەسەر ئەرز بە دووری یەك (1) مەتر لە هێڵەكانی سنووری یاریگا ئەوەش لە سەرەتای چوونە ژوورەوەی تیپەكان بۆ نێو یاریگا وبەجێهێشتنی یاریگا لە تایمی یەكەم وگەڕانەوەیان بۆ نێو یاریگا هەتا كۆتایی یارییەكە. هەروەها ڕیگە نادرێت بە دانانی پڕوپاگەندە بە سەر گۆڵەكان یان تۆڕی گۆڵ یان ئاڵای گۆشەكان یان ئاڵاكان، ونابێت هەر ئامێرێكی نامۆ وەك (كامێرا، مایكرۆفۆن....هتد) بە سەر ئەو شتانەوە بێت.

سەرەڕای ئەوەش دەبێت وەستاوی پڕوپاگەندەی بازرگانی بەلایەنی كەمەوە:

- ماوەی 1 مەتر (1 یاردە) لە هەردوو هێڵی تەنیشتی یاریگا دوور بێت.
- بە هەمان ماوەی هێڵی گۆڵ هەتا قوڵی تۆڕی گۆڵەكە دوور بێت. و
- ماوەی 1 مەتر (1 یاردە) لە تۆڕی گۆڵەكە دوور بێت.

### 13. دروشم و هێماکان (Logos and emblems):

ڕێگە نادرێت بە چاپکردنەوەی ودانانی هێما و دروشمەکانی یەکێتی ناوەندی تۆپی پێ ی نێودەوڵەتی (FIFA) یان یەکێتیە کیشوەرەکان یان یەکێتیە نیشتیمانییەکان یان هێمای پاڵەوانێتییەکان یان یانەکان یاخود هەر شوێنیکی تر بێت بە شێوەیەکی ڕاستەقینە یاخود خەیاڵی لەسەر یاریگا. هەروەها تۆڕی گۆڵەکان وئەو ناوچەیەی کەوتووتە نێوان گۆڵ وتۆڕی گۆڵەکە وئالآی گۆشەکان لە کاتی یاری. ڕێگە دەدرێت بە دروشم لەسەر ئەو پارچە ئالآیەی کە بە وەستاوی ئالآی گۆشەوەیە.

### 14. ڤیدۆی یاریدەدەری داوەر (Video Assistant Referees "VARs"):

ژووری ئیش پێکردنی ڤیدۆ (Video Operation Room "VOR"):

ڕووبەری پێداچوونەوەی داوەر (Referee review area "RRA"):

The VOR is where the video assistant referee (VAR), assistant VAR (AVAR) and replay operator (RO) work

---

(1): تەکنۆلۆجیای هێڵی گۆڵ (Goal-Line Technology):

http://quality.fifa.com/en/Goal-Line-Technology/

## بەندی (2) تۆپ (The Ball):

### 1. تایبەتمەندی وپێوانەکان (Qualities and measurements):

تۆپ دەبێت:

- خڕ بێت.
- لە ماددەیەکی گونجاو دروست کرابێت.
- چێوەکەی لە نێوان 70سم (28 بۆصە) و 68 سم (27 بۆصە) بێت.
- کێشەکەی لە نێوان 450 غم (16 اوقیە) و 410 غم (14 اوقیە) بێت لە سەرەتای دەستپێکردنی یاری.
- دەبێت پاڵەپەستۆی یەکسان بێت بە (1.1/0.6) ئەوە یەکسانە بە(1.100/600غم/سم$^2$) لەسەر ڕووی دەریا (کە ئەمە بەرامبەر 8.5 لیبرە / ئینج چوار گۆشە 15.6 لیبرە / ئینج چوار گۆشە).

هەموو ئەو تۆپانەی کە بەکاردێت لە یارییە پێشبڕکێ فەرمییەکان بە بەسەرپەرشتی یەکێتی تۆپی پێ نێودەوڵەتی یان یەکێتییە نیشتیمانییەکان ڕێکدەخرێت ئەوا دەبێت تۆپ یەکێ لەم دروشمانەی خوارەوە لەخۆبگرێت:

- پرۆگرامی کوالیتی فیفا (FIFA Quality PRO).
- کوالیتی فیفا (FIFA Quality).
- ستاندەردی یاری نێودەوڵەتی (IMS - INTERNATIONAL MATCH STANDARD).



• FIFA Quality PRO



• FIFA Quality



• IMS - INTERNATIONAL MATCH STANDARD

ئەو تۆپانەی کە دروشمەکانی کوالیتی پێشووی پێوەیە وەکو (FIFA Approved) یان (FIFA Inspected) یان ( International Matchball Standard) ئەوا لەوانەیە بەکاربهێنرێت لە پاڵەوانێتییەکانی پێشوو ئاماژەی پێکرا هەتا 2016/07/31.

هەر هێمایەك ئاماژەیە بەوەی کە تۆپەکە تاقیکراوەتەوە بە فەرمی و پێداویستی تەکنیکی تایبەت بۆ هەر هێمایەکی تێدایە سەرەڕای جێبەجێکردنی مەرجی پێداویستییەکانی بەندی 2 و دەبێت ڕەزامەندی ئەنجومەنی یاسادانانی نێودەوڵەتی (بۆرد)ی لەسەر بێت. ئەو پەیمانگایانەی کە هەڵدەستێت بەم تاقیکردنەوەیە ئەوا دەبێت ڕەزامەندی یەکێتی ناوەندی تۆپی پێ ی نێودەوڵەتی لەسەر بێت

کاتێ تەکنۆلۆجیای هێڵی گۆڵ (GLT) بەکاردەهێنرێت، ئەوا تۆپەکان دەبێت یەکێ لە دروشمەکانی کوالیتی هەڵ بگرێت کە لە سەرەوە باسکراوە.

پێشبڕکێ یەکێتییە نیشتیمانییەکان لەوانەیە پێویست بکات ئەو تۆپانە بەکاربهێنن کە یەکێ لەم دروشمانەی لەسەربێت.

ڕێگە نادرێت پروپاگەندەی بازرگانی لەسەر تۆپ دابنرێت لەو یارییانەی کە ئەنجام دەدرێت لە پێشبڕکێ فەرمییەکان کە بەسەرپەرشتی یەکێتی تۆپی پێ ی نێودەوڵەتی یان یەکێتییە کیشورەکان یان یەکێتییە نیشتیمانییەکان ڕێکدەخرێت، جگە لە هێما یان دروشمی تایبەت بە پاڵەوانێتیەکە یان دروشمی بازرگانی ئەو شوێنەی تۆپەکەی دروستکردووە. ڕێسای پاڵەوانێتیەکە دەبێت قەبارە و ژمارەی ئەو دروشمانە دیاری بکات.

2. گۆڕینی تۆپی بێ کەڵك (Replacement of a defective ball):

ئەگەر تۆپەکە کەڵکی نەما ئەوا:

- یاری دەوەستێت و
- یاری دەستپێدەکاتەوە بە بەردانەوەی تۆپی تازە لە شوێنی تەقینی تۆپەکە.

ئەگەر تۆپەکە کەڵکی نەما (تەقی) لە کاتی لێدانی سەرەتا یان لێدانی گۆڵ (ماڵی گۆڵ) یان لێدانی گۆشە یان لێدانی ئازاد یان لێدانی سزا یان هەڵدانی تەنیشت ئەوا یاری دەستپێدەکاتەوە بە دووبارەکردنەوەی حاڵەتەکە.

ئەگەر تۆپەکە کەڵکی نەما (تەقی) لە کاتی لێدانی سزا یان لە لێدانی سزای یەکلاکەرەوە دوای جوڵانەوەی تۆپ بۆ پێشەوە وپێش ئەوەی بەر هیچ یاریزانێك یان ڕاجە یان ستوونی گۆڵ بکەوێت ئەوا یاری دەستپێدەکاتەوە بە دووبارەکردنەوەی لێدانی سزا.

ڕێگە نادرێت بە گۆڕینی تۆپ تەنها بە ڕەزامەندی داوەر نەبێت.

3. تۆپی یەدەك (Additional balls):

دەتوانرێت تۆپی یەدەك دابنرێت لە دەورووبەری یاریگا وبەکاربهێنرێت لە کاتی یاری بە مەرجێ ئەو داخوازیانە ڕەچاو بکات کە لە بەندی (2) دا هاتووە وبەکارهێنانی دەبێت تەنها لە ژێر دەسەڵاتی داوەر بێت.

## بەندی (3) یاریزانان (The Players):

### 1. ژمارەی یاریزانان (Number of players):

یاری لە نێوان دوو تیپ دەكرێت، هەر تیپێك لە 11 یاریزان پێك دێت وەك بەرزترین ڕادە؛ پێویستە یەكێكیان گۆڵپارێز بێت. نابێت یاری دەست پێبكرێت یان بەردەوام بێت ئەگەر تیپێك لە حەوت (7) یاریزان كەمتر بوو.

ئەگەر ژمارەی تیپ كەمتر بێت لە 7 یاریزان بە هۆی چوونە دەرەوەی یاریزانێك یان زیاتر لە دوو یاریزان لە یاریگا بە ئەنقەست، ئەوا داوەر مەرج نیە یاری بوەستێنێت بەڵكو دەتوانێت یاسای سوود بەخش بەكاربهێنێت، بەڵام نابێت بهێڵێت دەست بە یاری بكرێتەوە دوای ئەوەی تۆپ دەچێتە دەرەوەی یاری ئەگەر ئەو تیپە كەمترین ڕادەی ژمارەی یاریزانانی نەگاتە 7 یاریزان.

ئەگەر ڕێسای پاڵەوانێتیەكە جەخت لەسەر تۆماركردنی ناوی هەموو یاریزانان ویاریزانانی یەدەك بكات پێش لێدانی سەرەتا، وئەو تیپە دەست بە یاری بكات بە ژمارەیەكی كەمتر لە 11 یاریزان، تەنها ئەو یاریزانانە ویاریزانە یەدەكەكان كە ناویان تۆماركراوە لەسەرەتاوە لە پێكهاتەی تیپەكە دەتوانن بەشدار بن لە یارییەكە لە كاتی گەیشتنیان بۆ یاریگا (ئەوەش بۆ تەواوكردنی 11 یاریزانەكە).

### 2. ژمارەی یاریزانانی گۆڕاو (Number of substitutions):

#### پێشبڕكێ فەرمییەكان (Official competitions):

ژمارەی یاریزانانی گۆڕاو هەتا پێنج (5) یاریزانی گۆڕاو كە زۆرترین ڕادەیە دەتوانرێت ئاڵوگۆڕی پێبكرێت لە پێشبڕكێی فەرمییەكان كە لەلایەن یەكێتی تۆپی پێ ی نێودەوڵەتی یان یەكێتیە كیشوەرییەكان یان یەكێتیە نیشتیمانیەكان بەڕێوەدەچێت جگە لە پێشبڕكێی پیاوان یان ئافرەتان كە بەشداری دەكەن لە تیپی یەكەمی (1) یانەكان لەسەر بەرزترین لووتكەی خولەكە یان تیپە نێودەوڵەتییەكان (ئاستی A) بۆ پێشكەوتووان كە تەنها هەتا 3 یاریزان كە زۆرترین ڕادەیە دەتوانرێت ئاڵوگۆڕی پێبكرێت.

دەبێت ڕێسای پاڵەوانێتی ژمارە بكات بە:

- دیاریكردنی ژمارەی یاریزانانی یەدەك كە ناونووس دەكرێن، كە زۆرترین ڕادەیە لە سێ هەتا دوانزە (3 - 12) یاریزانی یەدەك.
- یەك یاریزانی گۆڕاوی زیادەی تر دەتوانرێت بەكاربهێنرێت كاتێ یارییەكە دەگاتە تایمەكانی زیادە (داخۆ تیپەكە پێشتر هەموو گۆڕانكارییەكانی كردبێت یان نا).

#### یارییەكانی تر (Other matches):

لە یارییەكانی هەڵبژاردەی نەتەوەكانی یەكەم (A) دەتوانرێت دوانزە (12) یاریزانی یەدەك كە زۆرترین ڕادەیە ناونووس بكرێت ودەتوانرێت شەش (6) یاریزانی یەدەك ئاڵوگۆڕ بكرێت كە زۆرترین ڕادەیە.

لە هەموو یارییەكانی تردا دەتوانرێت زۆرترین یاریزانی یەدەك بەكاربهێنرێت بە مەرجێ:

- تیپەكان ڕەزامەندبن لە سەر زیاترین ڕادەی یاریزانە گۆڕاوەكان.
- ئاگاداری داوەر بكرێت پێش دەستپێكردنی یاری.

ئەگەر داوەر ئاگادار نەكرێتەو یان تیپەكان ڕێك نەكەوتن پێش دەستپێكردنی یاری، ئەوا تەنها (6) یاریزان كە زۆرترین ڕادەیە دەتوانرێت بگۆڕێن.

#### گەڕانەوەی یاریزانی گۆڕاو (Return substitutions):

بەكارهێنانی گەڕانەوەی یاریزانی گۆڕدراو (بۆ بەشداریكردن جارێكی تر) ڕێگە پێدراوە لە تۆپی پێ تەنها بۆ لاوان وگەورە پیاوان وخاوەن پێداویستیە تایبەتەكان وئاستە سەرەتاییەكان، بەمەرجێ ڕەزامەندی یەكێتی تۆپی پێ ی نیشتیمانی یان یەكێتیە كیشوەرەكان یان فیفای لەسەر بێت.

### 3. چۆنێتی جێبەجێکردنی کاری ئاڵوگۆڕین (Substitution procedure):

دەبێت ناوی یاریزانانی یەدەك بدرێت بە داوەر پێش دەستپێکردنی یاری. هەر یاریزانێکی یەدەك ناوی نەدرا بوو بە داوەر لەو کاتەدا ئەوا مافی بەشداریکردنی یاری نیە.

لە کاتی گۆڕینی یاریزان بە یاریزانی یەدەك ئەوا دەبێت پەیڕەوی ئەم خاڵانە بکرێت:

- داوەر ئاگادار بکرێتەوە پێش ئەوەی کاری ئاڵوگۆڕین ئەنجام بدرێت.
- دەبێت یاریزانی گۆڕاو روخسەت لە داوەر وەربگرێت بۆ بەجێهێشتنی یاریگا، مەگەر ئەو یاریزانەی کە داوای لێکراوە بگۆڕدرێت یاریگای بەجێهێشتبوو.
- یاریزانی گۆڕاو مەرج نیە یاریگا بەجێ بهێڵێت لە هێڵی ناوەڕاستەوە وناتوانێت بەشداری یاری بکاتەوە جارێکی تر، جگە لەوەی گەڕانەوەی یاریزانی گۆڕاو ڕێگە پێدراو بێت.
- ئەگەر یاریزانێك کاری ئاڵوگۆڕینی ڕەتکردەوە بۆ بەجێهێشتنی یاریگا، ئەوا یاری بەردەوام دەبێت.

یاریزانی یەدەك دێتە نێو یاریگا تەنها:

- لە کاتی وەستانی یاری.
- لە هێڵی ناوەڕاستەوە.
- دوای بەجێهێشتنی یاریگا لەلایەن یاریزانی گۆڕاو.
- دوای وەرگرتنی روخسەت لەلایەن داوەرەوە.

کاری ئاڵوگۆڕین تەواو دەبێت بە چوونە ژوورەوەی یاریزانی یەدەك بۆ نێو یاریگا؛ لەو ساتەوە یاریزانی گۆڕاو دەبێتە یاریزانی یەدەك ویاریزانی یەدەك دەبێتە یاریزان ودەتوانێت هەر دەستپێکردنەوەیەکی یاری جێبەجێ بکات.

هەموو یاریزانە یەدەکەکان و یاریزانە گۆڕاوەکان لە ژێر دەسەڵاتی داوەردا دەبن ئەگەر بەشداری یاری بکەن یان بەشداری یاری نەکەن.

### 4. شوێن گۆڕینی گۆڵپارێز (Changing the goalkeeper):

هەر یاریزانێك دەتوانێت شوێنی خۆی بگۆڕێت لەگەڵ گۆڵپارێز ئەگەر:

- داوەر ئاگادار بکرێتەوە پێش گۆڕانکارییەکە.
- گۆڕانەکە لەکاتی وەستانی یاریدا جێبەجێ بکرێت.

### 5. سەرپێچییەکان وسزادان (Offences and sanctions):

ئەگەر یاریزانی یەدەکی ناونووسکراو دەستی بە یاری کرد لە جیاتی یاریزانی ناونووسکراو بەبێ ئەوەی داوەر ئاگادار بکاتەوە ئەوا:

- داوەر ڕێگە دەدات بە یاریزانی یەدەکی ناونووسکراو بەردەوام بێت لە یاری.
- هیچ سزایەکی سەرزەنشتی بەکار ناهێنرێت لە دژی یاریزانی یەدەکی ناونووسکراو.
- یاریزانی ناونووسکراو دەبێتە یاریزانێکی یەدەك.
- ژمارەی گۆڕانکارییەکان کەم ناکرێتەوە.
- داوەر ڕاپۆرتێك لەسەر ڕووداوەکە دەداتە لایەنی پەیوەندیدار.

ئەگەر کاری ئاڵوگۆڕین ئەنجامدرا لە ماوەی پشووی نێوان تایمەکان یان لە پێش دەستپێکردنی تایمی زیادکراو، ئەوا دەبێت کاری ئاڵوگۆڕین تەواو بکرێت پێش دەستپێکردنەوەی یارییەکە. ئەگەر داوەر ئاگادار نەکرایەوە ئەوا یاریزانی یەدەکی ناونووسکراو دەتوانێت بەردەوام بێت لە یاری کردن وهیچ کارێکی سەرزەنشت کردن وسزادان بەکارناهێنرێت و ڕاپۆرت لەسەر حاڵەتەکە بەرزدەکرێتەوە بۆ لایەنی پەیوەندیدار.

ئەگەر یاریزانێك شوێنی خۆی گۆڕی لەگەڵ گۆڵپاریز بەبێ ئاگادارکردنەوەی داوەر:

- داوەر ڕێگە دەدات بە بەردەوام بوونی یاری.
- هەردوو یاریزان ئاگادار دەكرێنەوە (بەكارتی زەرد) لە گەڵ یەكەم چوونە دەرەوەی تۆپ لە یاری بەڵام سزا نادرێت ئەگەر هاتوو گۆڕانكارییەكە ڕوویدا لە پشووی نێوان تایمەكانی یاری (بە تایمەكاتی زیادكراوبشەوە) یان پشووی نێوان كۆتایی یاری وسەرەتای تایمەكانی زیادكراو /یان لێدانی سزای یەكلاكەرەوە لە خاڵی سزاوە.

لە كاتی ڕوودانی هەر سەرپێچیەكی تر لەم بەندە:

- هەردوو یاریزان ئاگادار دەكرێنەوە (بەكارتی زەرد).
- یاری دەستپێدەكات بە لێدانی ناڕاستەوخۆ لە شوێنی تۆپ كاتێ یاری لێ وەستێنرا.

### 6. یاریزانان و یاریزانە یەدەكە دەركراوەكان (Players and substitutes sent off):

ئەو یاریزانەی دەركرا (بەكارتی سوور):

- پێش پێدانی لیستی تیپ نابێت ناوونوس كرابێت لە لیستی تیپ بەهیچ سیفەتێك.
- دوای تۆماركردنی لە لیستی تیپ وپێش ئەوەی لێدانی سەرەتا جێبەجێ بكرێت ئەوا دەتوانرێت بگۆڕدرێت بە یاریزانێكی یەدەكی تۆماركراو، ونابێت كەسێكی تر لە شوێنی یاریزانی دەركراو بنووسرێت لە لیستی تیپ، هەروەها ژمارەی گۆڕانكاری ئەو تیپە كەم ناكرێتەوە.
- دوای دەستپێكردنی لێدانی سەرەتا ناتوانرێت بگۆڕدرێت بە یاریزانێكی یەدەك.

ئەو یاریزانە یەدەكەی كە دەركرا (بەكارتی سوور) پێش یان دوای لێدانی سەرەتا ناتوانرێت بگۆڕدرێت.

### 7. كەسە زیادەكان لە یاریگادا (Extra persons on the field of play):

ئەو ڕاهێنەر و كارگێرانەی تیپ كە تۆماركراون لە لیستی تیپ (جگە لە یاریزانان ویاریزانانی یەدەك) بە كارگێری تیپ دادەنرێن. هەر یەكێ تۆمار نەكرابێت لە لیستی تیپ وەكو یاریزان یان یاریزانی یەدەك یان كارگێری تیپ ئەوا بە هۆكاری دەرەكی دادەنرێت.

ئەگەر كارگێری تیپ یان یاریزانی یەدەك یان یاریزانی گۆڕاو یان یاریزانی دەركراو یان هۆكاری دەرەكی هاتە نێو یاریگاوە، ئەوا داوەر دەبێت:

- یاری بوەستێنێت ئەگەر بەشداری یارییان كرد (دەستێوەردان لە یاری).
- دوورخستنەوەی ئەو كەسە لەگەڵ وەستانی یاری.
- سزای سەرزەنشتی گونجاو بەكاربهێنێ.

ئەگەر یاری وەستێنرا و دەستێوەردان لە یاری كرا لەلایەن:

- كارگێری تیپ یان یاریزانی یەدەك یان یاریزانی گۆڕاو یان یاریزانی دەركراو، ئەوا یاری دەستپێدەكاتەوە بە لێدانی ڕاستەوخۆ یان لێدانی سزا.
- هۆكاری دەرەكی ئەوا یاری دەستپێدەكاتەوە بە بەردانەوەی تۆپ.

ئەگەر تۆپ بەرەو گۆڵ دەڕۆیشت ودەستێوەردانەكە ڕێگەی نەگرت لە یاریزانی بەرگری كە یاری بە تۆپ بكات، ئەوا ئەو گۆڵەكە ئەژمار دەكرێت ئەگەر تۆپەكە چووە گۆڵەوە (هەتا ئەگەر هاتوو بەركەوتن هەبوو لەگەڵ تۆپ) جگە لەوەی ئەگەر تۆپەكە چووە گۆڵی بەرامبەر.

### 8. یاریزان لە دەرەوەی یاریگا (Player outside the field of play):

ئەگەر ئەو یاریزانەی کە پێویست دەکات بە ڕوخسەتی داوەر بگەڕێتەوە جارێکی تر بۆ نێو یاریگا هەستا بە هاتنەوە بۆ نێو یاریگا بەبێ ڕوخسەتی داوەر، ئەوا داوەر دەبێت:

- یاری بوەستێنێت (نابێت یەکسەر یاری بوەستێنێت ئەگەر یاریزانەکە دەستێوەردانی لە یاری نەکردبوو یان دەستێوەردانی لەگەڵ داوەری یاری نەکرد یان توانرا یاسای سوود بەخش بەکاربهێنرێت).
- ئاگادار کردنەوەی یاریزان (بەکارتی زەرد) بۆ هاتنە نێو یاریگا بەبێ پرسی داوەر.
- فەرمان دەکرێت بەو یاریزانە کە یاریگا بەجێ بهێڵێت.

ئەگەر داوەر یاری وەستاند، ئەوا یاری دەستپێدەکاتەوە بە:

- لێدانی ڕاستەوخۆ لە شوێنی دەستێوەردانەکە.
- لێدانی ناڕاستەوخۆ لە شوێنی تۆپ کاتێ یاری لێ وەستێنرا ئەگەر هاتوو دەستێوەردان ڕووی نەدابوو.

ئەو یاریزانەی سنوری هێڵەکانی یاریگا دەبڕێ وەك بەشێك لە جوڵەی یاری مانای ئەوە ناگەیەنێت کە سەرپێچی کردووە.

### 9. تۆمارکردنی گۆڵ لە گەڵ بوونی کەسێکی زیادە لە یاریگا: (Goal scored with an extra person on the field of play)

پاش تۆمارکردنی گۆڵ وپێش دەستپێکردنەوەی یاری ئەگەر داوەر زانی کە کەسێکی زیادە لە یاریگادا بوو کاتێ گۆڵ تۆمارکرا:

- داوەر گۆڵەکە ڕەت دەکاتەوە ئەگەر کەسە زیادەکە:
  - یاریزان یان یاریزانی یەدەك یان یاریزانی گۆڕاو یان کارگێری تیپ یان یاریزانی دەرکراو بوو لەو تیپەی کە گۆڵی تۆمار کرد؛ ئەوا یاری دەستپێدەکاتەوە بە لێدانی ڕاستەوخۆ لە شوێنی کەسە زیادەکە.
  - هۆکاری دەرکی بوو و دەستێوەردانی کرد لە یاری، مەگەر ئەنجامی گۆڵەکە ببێتە ئەوەی کە ئاشکرا کراوەتەوە لەسەرەوە "کەسە زیادەکان لە یاریگادا".

یاری دەستپێدەکاتەوە بە لێدانی گۆڵ یان لێدانی گۆشە یان بەردانەوەی تۆپ.

- دەبێت داوەر گۆڵەکە ئەژمار بکات ئەگەر کەسە زیادەکە:
  - یاریزان یان یاریزانی یەدەك یان یاریزانی گۆڕاو یان یاریزانی دەرکراو یان کارگێری تیپ بوو لەو تیپەی کە گۆڵیان لێ کرا.
  - هۆکاری دەرکی بوو و دەستێوەردانی لە یاری نەکرد.

لە هەموو حاڵەتەکاندا دەبێت داوەر ئەو کەسە زیادە دوور بخاتەوە لە یاریگا.

ئەگەر دوای تۆمارکردنی گۆڵ ودەستپێکردنەوەی یاری داوەر زانی کە کەسێکی زیادە لە یاریگادا بوو کاتێ گۆڵ تۆمار کرا، ئەوا ناتوانرێت گۆڵەکە ڕەت بکرێتەوە. ئەگەر کەسە زیادە هێشتا هەر لە یاریگادا بوو، داوەر دەبێت:

- یاری بوەستێنێت
- کەسە زیادەکە دوور بخاتەوە
- دەستپێکردنەوەی یاری بە بەردانەوەی تۆپ یان لێدانی ئازاد بەپێی حاڵەتەکە

پێویست دەکات داوەر ڕاپۆرت بەرز بکاتەوە لەسەر ڕووداوەکە بۆ لایەنی پەیوەندیدار.

### 10. کاپتنی تیپ (Team captain):

کاپتنی تیپ هیچ پلە وپایە یان ئیمتیازێکی تایبەتی نیە بەڵکو پلەیەك لە بەرپرسیارێتی هەیە بەرامبەر هەڵس وکەوتی تیپەکەی.

## بەندی (4) كەرستەی یاریزانان (The Players' Equipment):

### 1. سەلامەتی (Safety):

نابێت یاریزان هیچ كەرستەیەك بەكاربهێنێت یان هەر شتێك لەبەر بكات كە مەترسیدار بێت.

هەموو جۆرەكانی گەوهەر (ملوانكە، ئەڵقە، بازنە، گوارە، باندی پێست، باندی پلاستیك...هتد) قەدەغەیە ودەبێت لابرێت. وبەستنی پلاستەر بەسەر گەورهەرەوە رێگە پێنەدراوە.

دەبێت یاریزانان بپشكنرێت پێش دەستپێكردنی یاری و پشكنینی یاریزانە یەدەكەكان پێش چوونە ژوورەوە بۆ نێو یاریگا. ئەگەر یاریزان كەرستەیەكی مەترسیدار یان رێگە پێنەدراو بەكار بهێنێت یان لەبەر بكات یان گەوهەر ئەوا دەبێت داوەر فەرمان بكات بەو یاریزانە كە:

- كەرستەكە لابرێت.
- یاریگا بەجێ بهێڵێت لەگەڵ یەكەم وەستانی یاری ئەگەر یاریزان نەیتوانی یان رازی نەبوو كوێ رایەڵی فەرمانی داوەر بێت.

ئەو یاریزانەی كە رەتی كردەوە كوێ رایەڵی فەرمانی داوەر بێت یان ئەو كەرستەیەی لەبەر كردەوە جارێكی تر ئەوا دەبێت ئاگادار بكرێتەوە (بە كارتی زەرد).

### 2. كەرستەی چەسپاو (اجباری) (Compulsory equipment):

ئەو كەرستە چەسپاوانەی (بنەڕەتییانەی) كە سەپاون لە سەر یاریزان پێك دێت لەم شت ومەكە جیاجیانەی خوارەوە:

- درێسی یاری قۆڵدار.
- شۆرت.
- گۆرەوی: دانانی پلاستەر (شریت) یان هەر ماددەیەكی تر یان بەستنی هەر ماددیەك لەبەشی دەرەوەی گۆرەوی ئەوا دەبێت لە هەمان ڕەنگی بەشی گۆرەوییەكە بێت كە لەزگەكەی لە سەردەبەسترێت یان دادەپۆشێت.
- پارێزەری ئێسكی قاچ: دەبێت لە ماددەیەكی شیاو دروست بكرێت وتا ڕادەیەكی گونجاو پاراستن دەستەبەر بكات وبە گۆرەوی داپۆشرابێت.
- پێڵاوی یاری.

گۆڵپارێز دەتوانێت خواری تراكسوت لەبەر بكات.

ئەگەر یاریزان پێڵاوەكەی یان پارێزەری ئێسكی قاچی بەبێ ئەنقەست دەرچوو ئەوا دەبێت بە زووترین كات بیكاتەوە شوێنی خۆی ونابێت زیاتری پێبچێت ئەگەر تۆپی داهاتوو چووە دەرەوەی یاری: وئەگەر پێشتر یاریزانەكە هەستا بە یاریكردن بە تۆپ و/یان تۆماركردنی گۆڵ ئەوا ئەو گۆڵە ئەژمار دەكرێت.

### 3. ڕەنگەكان (Colours):

- هەردوو تیپ دەبێت ڕەنگێ لەبەر بكەن كە هەردوو لا جیا بكرێنەوە لە یەكتری و جیاواز بێت لە داوەرانی یاری.
- دەبێت گۆڵپارێز ڕەنگی درێسەكەی جیاواز بێت لە ڕەنگی درێسی یاریزانانەكانی تر و داوەرانی یاری.
- ئەگەر درێسی هەردوو گۆڵپارێز لە یەك ڕەنگ بوون وهیچیان درێسی یەدەكیان (زیادەیان) پێنەبوو، داوەر رێگە دەدات بە دەستپێكردنی یاری.

دەبێت جل وبەرگی ژێرەوە لە هەمان ڕەنگی سەرەكی بێت لە ڕووی قۆڵی درێسی یاری: شۆرتی ژێرەوە یان تەسك (كۆڵۆن) دەبێت لە هەمان ڕەنگی سەرەكی شۆرتەكە بچێت یان لە هەمان ڕەنگی بەشی خوارەوەی شۆرتەكە بچێت – هەموو یاریزانانی هەمان تیپ دەبێت هەمان ڕەنگ لەبەر بكەن.

4. كەرەستەی تر (Other equipment):

كەرەستەی پارێزی نا-مەترسیدار ڕێگەی پێدراوە، بۆ نموونە پارێزی سەر و دەم وچاو وئەژنۆ و ئانیشك كە لە ماددەیەكی نەرم وكێشێكی سووك دروستكراوە، وەك كڵاوی گۆڵپارێز و چاویلكەی وەرزشی.

پارێزەری سەر (Head Covers):

كاتێ پارێزەری (داپۆشەری) سەر دادەنرێت (كڵاوی گۆڵپارێز ناگرێتەوە) ئەوا:

- دەبێت ڕەش بێت یان لە هەمان ڕەنگی درێس بێت (بە مەرجێ هەموو یاریزانان هەمان ڕەنگ لەبەر بكەن).
- دەبێت شێوە و ڕووكەشی گشتی كەرەستەی یاریزانان وون نەبێت.
- نابێت پارێزەری سەر یەك پارچە بێت لەگەڵ درێسی یاری.
- نابێت مەترسی هەبێت بۆ سەر ئەو یاریزانەی كە بەكاری دەهێنێت یان هەر یاریزانێكی تر (وەكو چۆنێتی كردنەوە وداخستن لە دەوروبەری مل).
- نابێت ڕووكەشی پارێزەری سەر هیچ بەشێكی هاتبێتە دەرەوە (بەشی دەرپەڕیو).

پەیوەندی ئەلیكترۆنی (Electronic communication):

ڕێگە نادرێت پەیوەندی ئەلیكترۆنی دابنرێت یان بەكاربهێنرێت لە نێوان یاریزانان (یاریزانانی یەدەك ویاریزانی گۆڕاو ویاریزانی دەركراویش دەگرێتەوە). ڕێگە نادرێت پەیوەندی ئەلیكترۆنی دابنرێت لە لایەن كارگێڕانی تیپ ویاریزانان جگە لەوەی ئەگەر هاتوو حاڵەتەكە پەیوەندی هەبوو بە بەرژەوەندی وسەلامەتی یاریزانان.

كاری ئەلیكترۆنی وسیستەمی شوێنەواری پێی (EPTS) (Electronic performance and tracking systems "EPTS"):

بەكارهێنانی پەیوەندی ئەلیكترۆنی لە هەر شێوەیەك لە نێوان یاریزانان و/یان ستافی هونەری ڕێگە پێنەدراوە (ئەمە یاریزانانی یەدەك ویاریزانی گۆڕا ویاریزانی دەركراو دەگرێتەوە).

سیستەمی كاركردن وزانینی شوێنەواری پێی ئەلیكترۆنی (EPTS) (دەبێت ڕەزامەندی یەكێتی تۆپی پێ ی نیشتیمانی/ڕێكخەری پێشبڕكێ یەكە وەربگیرێت):

- نابێت مەترسیدار بێت.
- ڕێگە نادرێت بە ناردنی زانیاری وداتا لەم ئامێرە یان سیستەمە بۆ مەبەستی وەرگرتنی زانیاری یان بەكارهێنانی لە ناوچەی هونەری لە كاتی یاریدا.

5. دروشم وهێما و وێنە ورێکلام (Slogans, statements, images and advertising):

نابێت کەرەستەی یاریزان هیچ دروشم یان پروپاگەندە یان وێنەی سیاسی یان ئاینی یان کەسایەتی هەڵبگرێت. نابێت یاریزانان کراس یان درێسی ژێرەوە ئاشکرا بکەن کە دروشم یان لۆگۆ یان پروپاگەندە یان وێنەی سیاسی یان ئاینی یان کەسایەتی هەلگرتبێت جگە لە لۆگۆی دروستکەری شوێنەکە. بۆ هەر سەرپێچییەك ئەوا دەبێت یاریزان و/یان تیپ سزا بدرێت لەلایەن ڕێکخەری پێشبڕکێ و یەکێتی تۆپی پێ ی نیشتیمانی یان لەلایەن فیفا پاساوی هەبێت.

6. سەرپێچییەکان وسزادان (Offences and sanctions):

بۆ هەر سەرپێچییەك بۆ ئەم بەندە ئەوا پێویست ناکات یاری بوەستێت وياريزان:

- ئاڕاستە بکرێت لەلایەن داوەر کە یاریگا بەجێ بهێلێت بۆ ڕاستکردنەوەی کەل وپەلەکەی.
- یاریگا بەجێ بهێلێت کاتێ یاری وەستا بێت مەگەر پێشتر کەل وپەلەکەی ڕاست کردبێتەوە.

ئەو یاریزانەی کە یاریگا بەجێ دەهێلێت بۆ ڕاستکردنەوە یان گۆڕینی کەل وپەلەکەی دەبێت:

کەل وپەلەکەی بپشکێنرێت لەلایەن داوەرانی یاری پێش گەڕانەوەی بۆ نێو یاریگا.

تەنها دەتوانێت بگەرێتەوە نێو یاریگا بە پرسی داوەر (کە ئاماژەی بۆ دەکات لە کاتی یاری).

ئەو یاریزانەی بەبێ پرسی داوەر دێتە نێو یاریگا دەبێت ئاگادار بکرێتەوە (بە کارتی زەرد) وئەگەر یاری وەستێنرا بۆ پێدانی کارتی زەرد ئەوا دەبێتە لێدانی ناڕاستەوخۆ لە شوێنی تۆپ کاتێ یاری لێ وەستێنرا. مەگەر دەستێوەردان هەبوو ئەوا دەبێتە لێدانی ڕاستەوخۆ (یان لێدانی سزا) لە شوێنی



## بەندی (5) داوەر (The Referee):

### 1. دەسەڵاتی داوەر (The authority of the referee):

هەموو یارییەك کۆنترۆڵ دەکرێت لەلایەن داوەرەوە، ئەویش هەموو دەسەڵاتێکی هەیە بۆ جێبەجێکردنی بەندەکانی یاسای تۆپی پێ سەبارەت بەو حاڵەتانەی پەیوەندی بە یارییەوە هەیە.

### 2. بڕیارەکانی داوەر (Decisions of the referee):

بڕیارەکان جێبەجێ دەکرێت بەپێی باشترین توانای داوەر بەپێی یاسای تۆپی پێ و "ڕوحی یاری" وئەمەش لەسەر ڕای داوەر کەوتووە کە بە بۆچوونی هەڵدەستێت بە کارێکی گونجاو لە چوارچێوەی یاسای تۆپی پێ.

بڕیارەکانی داوەر کۆتاییە دەربارەی ڕاستییەکان وئەو ڕووداوانەی کە پەیوەندیان بە یارییەوە هەیە، وئەمە ئەوەش دەگرێتەوە کە ئەگەر هاتوو گۆڵ بوو یان گۆڵ نەبوو و ئەنجامی یارییەکە. دەبێت هەمیشە ڕێز لە بڕیارەکانی داوەر وهەموو داوەرەکانی تری یاری بگیرێت.

داوەر ناتوانێت بڕیاری خۆی بگۆڕێت ئەگەر هەستی کرد هەڵە بووە ئەوەش پاش دەستپێکردنەوەی یاری یان لەسەر ئاموژگاری یەکێ لە داوەرانی یارییەکە یان داوەر ئاماژەی دا بە تەواو بوونی تایمی یەکەم یان تایمی دووەمی یاری (تایمی زیادکراویش دەگرێتەوە) و یاریگای بەجێ هێشتبێت یان کۆتایی بە یارییەکە هاتبێت.

ئەگەر داوەر بە شێوەیەکی کاتی نەیتوانی بەردەوام بێت لە بەڕێوەبردنی یارییەکە ئەوا یارییەکە بەردەوام دەبێت لەژێر سەرپەرشتی داوەرەکانی تری یارییەکە هەتا تۆپەکە دەچێتە دەرەوەی یاری.

### 3. دەسەڵات وئەرکەکانی (Powers and duties):

داوەر هەڵدەستێت بە:

- جێبەجێکردنی یاسای تۆپی پێ.
- کۆنترۆڵ کردنی یارییەکە بە هاریکاری لەگەڵ داوەرانی تری یارییەکە.
- کاری کاتگر دەبینێت و هەڵدەستێت بە تۆمارکردنی ڕووداوەکانی یاری و پێشکەش کردنی ڕاپۆرتی یاری بۆ لایەنی پەیوەندیدار، ئەو ڕاپۆرتە ئەو زانیارییانە دەگرێتەوە کە لەسەر سزای سەرزەنشتی و هەر ڕووداوێکی تر کە ڕوو دەدات پێش یاری یان لە کاتی یاری یان لە پاش یاری.
- سەرپەرشتیارکردن و/یان ئاماژەدان بە دەستپێکردنەوەی یاری.

#### یاسای سوود بەخش (Advantage):

ڕێگە بە بەردەوام بوونی یاری دەدرێت کاتێ هەڵە یان سەرپێچی ئەنجام دەدرێت وئەو تیپەی سەرپێچی بەرامبەر کراوە سوودی وەرگرت لە یاسای سوود بەخش، وسزای هەڵەکە یان سەرپێچییەکە دەدرێت ئەگەر هاتوو سوودی پێشبینی نەهاتە دی (واتە یاسای سوود بەخش سەری نەگرت) لەو کاتە یان لە چەند چرکەی داهاتوو.

#### کاری سەرزەنشتی (Disciplinary action):

- کاتێك زیاتر لە یەك سەرپێچی لە هەمان کات ڕوو دەدات ئەوا سزای توندترین سەرپێچی دەدرێت لە ڕووی کاری سەرزەنشتی ودەستپێکردنەوەی یاری وتوندوتیژی جەستەیی وکاریگەری تەکتیکیەوە.
- سزای سەرزەنشتی بەکاردەهێنێت دژی ئەو یاریزانانەی کە تۆمەتبارن بە سەرپێچی ئاگادار کردنەوە (بە کارتی زەرد) ودەرکردن (بە کارتی سوور).
- دەسەڵاتی کاری سەرزەنشتی هەیە لەو کاتەی دێتە ناو یاریگا بۆ پشکنینی پێش یاری هەتا بەجێهێشتنی یاریگا پاش کۆتایی یاری (ئەمە لێدانی یەکلاکەرەوەش دەگرێتەوە). ئەگەر پێش چوونە ژوورەوەی داوەر بۆ نێو یاریگا بۆ دەستپێکردنی یاری یاریزانێك سەرپێچییەکی کرد کە شایستەی دەرکردنە

(بە کارتی سوور) ئەوا داوەر دەسەڵاتی ئەوەی هەیە کە ڕێگری لەو یاریزانە بکات بە بەشداری کردن لە یاری (سەیری بەندی 3 بکە بڕگەی 6)؛ هەروەها داوەر هەڵدەستێت بە بەرزکردنەوەی ڕاپۆرت لەسەر هەر بەد ڕەفتارێکی تر.

- دەسەڵاتی پیشاندانی کارتی زەرد و سووری هەیە وکاتێ ڕێسای پاڵەوانێتییەکە ڕێگە دەدات بە دوورخستنەوەی یاریزان بە شێوەیەکی کاتی، لە چوونە نێو یاریگا لە سەرەتای دەستپێکردنی یاری هەتا پاش کۆتایی یاری، ئەمە پشووی نێوان تایمەکان وتایمەکانی کاتی زیادکراو و لێدانی یەکلاکەرەوەش دەگرێتەوە.
- کاری پێویست دەگریتەبەر دژی کارگێڕانی تیپ ئەوانەی کە ناتوانن زاڵ بن بە سەر هەڵس وکەوتی خۆیان بە شێوەیەکی بەرپرسیارانە، ولەوانەیە دوور بخرێنەوە لە یاریگا و ئەو چواردەورەی کە پەیوەندیان بە یاریگاوە هەیە.
- کاری پێویست دەگرێتەبەر لەسەر ئامۆژگاری داوەرەکانی تری یاری سەبارەت بەو ڕووداوانەی کە داوەر نەیبینیوە.

### یاریزانانی پێکراو (Injured):

- ڕێگە دەدات بە بەردەوام بوونی یاری هەتا تۆپ دەچێتە دەرەوەی یاری ئەگەر هاتوو یاریزان تووشی پێکانێکی سووك بوو.
- یاری دەوەستێنێت ئەگەر یاریزان بە شێوەیەکی سەخت پێکرا ودڵنیا بێت لە دوورخستنەوەی یاریزانی پێکراو لە یاریگا. لەوانەیە یاریزانی پێکراو چارەسەر وەرنەگرێت لە یاریگا وتەنها دێتەوە نێو یاریگا کاتێ یاری دەستپێدەکرێتەوە؛ ئەگەر تۆپ لە یاری بوو ئەوا گەڕانەوەی دەبێت لە هێڵی تەنیشتەوە بێت بەڵام ئەگەر تۆپ لە دەرەوەی یاری بوو ئەوا دەتوانێت بێتە نێو یاریگا لەهەر سنوورێکی یاریگا بێت. (یاریزانی پێکراو دەبێت یاریگا بەجێ بهێڵێت بە مەبەستی چارەسەرکردن بەدەر لەم حاڵەتانەی خوارەوە) بەدەرەکان لە پێویستی بەجێهێشتنی یاریگا دەبێت تەنها کاتێ:
  - گۆڵپارێز دەپێکرێ
  - بەرکەوتن لە نێوان گۆڵپارێز و یاریزان وپێویستیان بە چاودێری بە پەلە هەبێت.
  - یاریزانان لە هەمان تیپ دەپێکرێن وپێویستیان بە چاودێری بە پەلە هەبێت.
  - پێکانێکی توند ڕوودەدات.
  - یاریزان تووشی پێکان دەبێت لە ئەنجامی سەرپێچییەکی جەستەیی کە بە هۆیەوە بەرامبەر ئاگادارکرایەوە (بە کارتی زەرد) یان دەرکرا (بە کارتی سوور) (بۆ نموونە: بەرەنگاری هەڵەشەیی یان یاری مەترسیدار) ئەگەر هاتوو هەڵسەنگاندن/چارەسەر بە خێرایی تەواو بێت.
- دڵنیا بێت لەوەی کە هەر یاریزانێك تووشی خوێن بەربوون بوو یاریگا بەجێ بهێڵێت. ئەو یاریزانە دەتوانێت بگەڕێتەوە نێو یاریگا تەنها کاتێ ئاماژەیەك لە داوەر وەردەگرێت، کە ئەو داوەرە دەبێت ڕازی بێت لەوەی خوێن بەربوونەکەی وەستاوە ونابێت هیچ خوێنێك بەسەر کەل وپەلی یاریزانەکەوە بێت.
- ئەگەر داوەر ڕێگەی دا بە پزیشکەکان و/یان هەڵگری نەقالە کە بێنە نێو یاریگا ئەوا ئەو یاریزانە دەبێت یاریگا بەجێ بهێڵێت لەسەر نەقالەکە یان بە پێ ی خۆی. ئەو یاریزانەی گوێ ڕایەڵ نەبێت ئەوا دەبێت ئاگادار بکرێتەوە (بە کارتی زەرد) لەبەر ڕەفتاری ناوەرزشی.
- ئەگەر داوەر بڕیاریدا بە ئاگادارکردنەوە (بە کارتی زەرد) یان بە دەرکردنی ئەو یاریزانەی کە پێکرا و پێویست بوو یاریگا بەجێ بهێڵێت بۆ چارەسەرکردن ئەوا داوەر دەبێت کارتەکەی نیشان بدات پێش ئەوەی یاریگا بەجێ بهێڵێت.
- ئەگەر یاری نەوەستێنرا لەبەر هەر هۆکارێك، یان ئەگەر هاتوو ئەو پێکانەی یاریزان بە هۆی سەرپێچی لە یاسای تۆپی پێ نەبوو ئەوا یاری دەستپێدەکاتەوە بە بەردانەوەی تۆپ.

### دەستێوەردانی دەرەکی (Outside interference):

- یاری دەوەستێت یان ڕادەگیرێت یان هەڵپەسێردراو دەکرێت (تەواوناکرێت) بە هۆی سەرپێچی کردن لە یاسای یارییەکە یان بە هۆی دەستێوەردانێکی دەرەکی بۆ نموونە ئەگەر:
  - ڕووناکییەکانی یاریگا کەم بن وبەش نەکەن.
- هاندەر هەڵدەستێت بە فڕێدانی شتێکی بەرجەستە وبەر داوەری یاری یان یاریزان یان کارگێری تیپ دەکەوێت ئەوا لەوانەیە داوەر ڕێگە بدات بە بەردەوام بوونی یاری یان هەستێت بە وەستان یان ڕاگرتن یان هەڵپەسێردراوی (تەواونەکردنی) یارییەکە وئەمەش دەکەوێتە سەر توندوتیژی ڕووداوەکە.
- ئەگەر هاندەرێك هەستا بە فیکە لێدان وبووە هۆی دەستێوەردان لە یاری ئەوا دەبێت یارییەکە بوەستێنرێت ویاری دەستپێدەکاتەوە بە بەردانەوەی تۆپ.
- ئەگەر تۆپێکی زیادە یان شتێکی بەرجەستە یان گیانەوەر هاتە نێو یاریگا کاتێ تۆپ لە یاری بوو ئەوا داوەر دەبێت:

- یاری بوەستێنێت (ودەستپێکردنەوەی یاری بە بەردانەوەی تۆپ) تەنها ئەگەر هاتوو دەستێوەردان لە یاری کرا مەگەر تۆپەکە بەرەو گۆڵ بڕوات ودەستێوەردانەکە ڕێگری نەکرد لە یاریزانی بەرگری کە یاری بە تۆپ بکات، گۆڵەکە ئەژمار دەکرێت ئەگەر تۆپەکە بچێتە گۆڵەوە (تەنانەت ئەگەر بەرکەوتنش ڕوویدا لەگەڵ تۆپ).
- ڕێگە بدات بە بەردەوام بوونی یاری ئەگەر هاتوو هۆکارە دەرەکیەکە دەستێوەردانی نەکرد لە یاری و دوور خرایەوە لە زووترین دەرفەتی شیاو.
- ڕێگە نەدات بە کەسانی ڕێگە پێنەدراو کە بێنە نێو یاریگا.

### 4. ڤیدۆی یاریدەدەری داوەر (Video Assistant Referees "VARs"):

### 5. کەرەستەی داوەر (Referee's equipment):

کەرەستە چەسپاوانەکان (اجباری):
- فیکە (چەند فیکەیەك)
- کاتژمێر (چەند کاتژمێرێك)
- کارتی زەرد و سوور (چەند کارتێك)
- پەڕاوی تێبینی (یان بە مانایەکی تر تۆمارکردنی ڕووداوەکانی یاری)

#### کەرەستەی تر (Other equipment):

ڕێگە دەدرێت بە داوەر بۆ بەکارهێنانی:
- کەرەستەیەك بۆ پەیوەندی کردن لەگەڵ داوەرەکانی تری یاری – زەنگ/ئاڵای ئاگادارکردنەوە، میکرۆفۆن .... هتد.
- سیستەمی کارکردن وزانینی شوێنەواری پێی ئەلیکترۆنی (EPTS) یان کەرەستەی تر بۆ چاودێری لیهاتووی جەستەیی.

دانانی زێر و زیو یان هەر کەرەستەیەکی تری ئەلیکترۆنی لەلایەن داوەر و داوەرەکانی تری یاری ڕێگە پێنەدراوە (قەدەغەیە).

### 5. هێماکانی داوەر (Referee signals):

ئاماژەدان بەو وێنانەی خوارەوە پەسەندکردنە بە هێماکانی داوەر.

سەرەڕای حاڵی حازری بەکارهێنانی هێمای هەردوو دەست بۆ یاسای سوودبەخش، هاوشێوەی ئەوا ئێستا بەکارهێنانی هێمای یەك دەست ڕێگە پێدراوە چونکە ئاسان نیە بۆ داوەران هەمیشە هەردوو دەستیان بەرزبکەنەوە (درێژ بکەنەوە) لە کاتی ڕاکردندا.



لێدانی ڕاستەوخۆ



لێدانی ناڕاستەوخۆ



یاسای سوود بەخش 2



یاسای سوود بەخش 1



**کارتی زەرد و سوور**



**لێدانی سزا**



**لێدانی گۆڵ (ماڵی گۆڵ)**



**لێدانی گۆشە (کۆرنە)**



**پشکنین** پەنجە بۆ گوێ، دەست وقۆڵەکەی تر درێژ دەکرێت



**پێداچوونەوە** نیشانەی تەلەفزیۆن

### 6. بەرپرسیارێتی داوەرانی یاری (Liability of Match Officials):

**داوەر و داوەرەكانی تری یاری بەپرسیارنین لە:**

- **هەر جۆرێك لە پێكان كە تووشی یاریزان یان كارگێڕان یان هاندەران بێت.**
- **هەر زیانێك تووشی شتومەكەكان بێت لەهەر جۆرێك بێت.**
- **هەر زیانێك كە تووشی هەر كەسێك یان یانەیەك یان كۆمپانیایەك یان یەكێتیەك یان دەزگایەكی تر بێت كە چاوەڕوانكراوە یان لەوانەیە ڕووبدات بە هۆی هەر بڕیارێكی داوەر لە ژێر زاراوەی یاسای تۆپی پێ یان لە ڕووی كاری ئاسایی كە پێویستە بۆ ڕاگرتن یان بەردەوام بوونی یاری یان كۆنترۆڵ كردنی یاری.**

**ئەو بڕیارانە لەوانەیە ئەمانە بگرێتەوە :**

- **بڕیاردان لەسەر چۆنێتی گۆڕەپانی یاریگا ودەورووبەری یاریگا یان حاڵەتی كەش وهەوا كە بواری یاریكردن بدات یان نا.**
- **بڕیاردان لەسەر هەڵپەسێردراوی (تەواونەكردنی) یاری لە بەر هەر هۆیەك بێت.**
- **بڕیاردان لە گونجاوێتی ئەو كەل وپەلانەی نێو یاریگا وئەو تۆپەی بەكاردێت لە كاتی یاریدا.**
- **بڕیار لەسەر وەستان یان نەوەستانی یاری لە ئەنجامی دەستێوەردانی هاندەران یان هەر كێشەیەك لە ناوچەكانی هاندەران.**
- **بڕیاردان بۆ وەستان یان نەوەستانی یاری لە پێناو گواستنەوەی یاریزانی پێكراو بۆ دەرەوەی یاریگا لە پێناوی چارەسەر كردنی.**
- **بڕیاردان لە سەر گواستنەوەی یاریزانی پێكراو بۆ دەرەوەی یاریگا لە پێناو چارەسەر كردنی.**
- **بڕیاردان بە ڕێگەپێدان یان ڕێگەپێنەدان لەسەر جل وبەرگ یان ئەو كەرەستانەی كە یاریزان بەكاری دێنێ.**
- **بەپێی ئەو دەسەڵاتەی هەیەتی، بڕیاردان لەسەر ڕیگەپێدان یان ڕیگەپێنەدانی هەر كەسێك كە بوونیان هەبێت لە نزیك یاریگا وچواردەوورەكەی (ئەو كەسانە دەگرێتەوە وەك تیپ یان بەرپرسی یاریگا یان پیاوانی ئاسایش وێنەگران وبەرپرسیارانی ڕاگەیاندن).**
- **هەر بڕیارێك كە داوەر دەیدات بە گوێرەی یاسای یارییەكە یان هەر بڕیارێك كە بگونجێ لە گەڵ ئەركەكانی لەژێر زاراوەی ڕێسای فیفا یان یەكێتیە كیشوەرەكان یان یەكێتیە نیشتمانیەكان یان ڕێنمایی یان ڕێسای پێشبڕكییەكە كە یارییەكەی لەسەر دەڕوات.**

## بەندی (6) داوەرەكانی تری یاری (The Other Match Officials):

لەوانەیە داوەركانی تری یاری دابنرێت لە یارییەكان (دوو یاریدەدەری داوەر، داوەری سێیەم، دوو یاریدەدەری داوەری زیادە ویاریدەدەری داوەری یەدەك). وهەڵدەستن بە یارمەتیدانی داوەر و كۆنترۆڵ كردنی یاری بەپێی یاسای یارییەكە بەڵام بڕیاری كۆتایی هەمیشە لەلایەن داوەرەوە دەبێت.

داوەركانی یاری كاردەكەن لە ژێر ئاڕاستەی داوەر. لە حاڵەتی دەستێوەردانی ئێجگار زۆر یان ڕەفتاری نەگونجاو لەلایەن داوەركانی تری یاری، ئەوا داوەر هەڵدەستێت بە دوورخستنەوەی ئەو یاریدەدەرەی لە ئەركەكانی وهەڵدەستێت بە بەرزكردنەوەی ڕاپۆرت بۆ لایەنی پەیوەندیدار.

جگە لە یاریدەدەری داوەری یەدەك، ئەوا داوەرەكانی تری یاری یارمەتی داوەر دەدەن بۆ سەرپێچی و هەڵەكان كاتێ گۆشەی بینینیان لە داوەر ڕوونترە وهەڵدەستن بە پێشكەش كردنی ڕاپۆرت بۆ لایەنی پەیوەندیدار لەسەر هەر ڕەفتارێكی توندتیژ یان حاڵەتێكی تر كە ڕوویدا لە دەرەوەی بینینی داوەر وداوەرەكانی تری یاری. وپێویستە داوەر و داوەرەكانی تری یاری یەكتری ئاگاداربكەنەوە لەهەر ڕاپۆرتێك كە بەرز بكرێتەوە.

داوەرەكانی تری یاری هەڵدەستن بە یارمەتیدانی داوەر بە پشكنینی یاریگا وتۆپەكان وكەل وپەلی یاریزانان (ئەمە ئەوەش دەگرێتەوە كە گرفتەكان چارەسەر بووە: وەكو كەرەستەی یاریزانان) وتۆماركردنی كات وگۆڵەكان و بەد ڕەفتاری ...هتد.

ڕێسای پێشبڕكێ دەبێت بە ڕوونی ئاماژە بكات بەوەی كێ جێگیرەوەی داوەری یاری دەگرێتەوە كاتێ كە ناتوانێت دەست بە یاری یان بەردەوام بێت لە داوەری وهەر گۆڕانكارییەك پەیوەندی هەبێت بەم حاڵەتەوە، بە تایبەتی لە حاڵەتی بێ توانایی داوەر بۆ دەستپێكردن یان بەردەوام بوونی یاری ئەوا دەبێت ڕوون وئاشكرا بێت كە ئایا داوەری چوارەم یان یاریدەدەری داوەری بە ئەزموون یان یاریدەدەری داوەری یەدەكی بە ئەزموون شوێنی دەگرێتەوە.

### 1. یاریدەدەرانی داوەر (Assistant referees):

هەڵدەستن بە ئاماژەدان كاتێ:

- تۆپ بە تەواوەتی (بە هەموو قەبارەی تۆپەكەوە) دەچێتە دەرەوەی یاریگا وكام تیپ مافی لێدانی گۆشە (كۆرنە) یان لێدانی گۆڵ (ماڵی گۆڵ) یان هەڵدانی تەنیشت هەیە.
- یاریزان لە ئۆفسایدە كە دەبێت سزا بدرێت.
- كاری ئاڵوگۆڕین داوا دەكرێت.
- لەكاتی ئەنجامدانی لێدانی سزا، ئەگەر گۆڵپارێز جوڵا بۆ پێشەوە پێش لێدانی تۆپەكە یان ئەگەر هاتوو تۆپەكە هێڵی گۆڵی بڕی: ئەگەر یاریدەدەرانی داوەری زیادە دەستنیشان كرابوون ئەوا یاریدەدەری داوەر لە ڕێكی نیشانەی سزا دەوەستێت.

هەروەها یاریدەدەری داوەر یارمەتی داوەر دەدات بە چاودێری كردنی كاری ئاڵوگۆڕین.

یاریدەدەری داوەر دەتوانێت بێتە نێو یاریگا بۆ یارمەتیدان لە پێناو كۆنترۆڵ كردن (ڕێكخستنی دیوار) ماوەی 9.15 م (10 یاردە).

2. داوەری چوارەم (Fourth official):

یارمەتیدانی داوەری چوارەم هەروەها ئەمانەش دەگرێتەوە:

- سەرپەرشتی كردنی كاری ئاڵوگۆڕێن.
- پشكنینی كەرەستەی یاریزانان ویاریزانانی یەدەك.
- هاتنەوە ناو یاریگا جارێكی تر دوای ڕوخسەت یان ئاماژەدانی داوەر.
- سەرپەرشتی كردنی گۆڕینی تۆپەكان دەكات.
- ئاماژەدان بە كەمترین ماوەی زیاكراو كە داوەر ئاماژەی پێدەكات لە كۆتایی هەر تایمێكی یاری (ئەمە تایمەكانی كاتی زیادكراویش دەگرێتەوە).
- ئاگاداركردنەوەی داوەر لە هەر ڕەفتارێكی نابەجێ كە لەلایەن ئەو كەسانە ئەنجام دەدرێت كە لە ناوچەی هونەری دانیشتوون.

3. یاریدەدەرانی داوەری زیادە (Additional assistant referees):

یارمەتیدانی یاریدەدەرانی داوەری زیادە هەروەها ئەمانەش دەگرێتەوە:

- چوونە دەرەوەی تۆپ بە تەواوەتی لە هێڵی گۆڵ، ئەمە تۆماركردنی گۆڵ یش دەگرێتەوە.
- چ تیپێك مافی لێدانی گۆشە (كۆرنە) یان لێدانی گۆڵ (ماڵی گۆڵ)ی هەیە.
- لەكاتی ئەنجامدانی لێدانی سزا، ئەگەر گۆڵپارێز جوولا بۆ پێشەوە پێش لێدانی تۆپەكە وئەگەر تۆپەكە هێڵی گۆڵ ببڕێ.

4. یاریدەدەری داوەری یەدەك (Reserve assistant referee):

تەنها ئەركی یاریدەدەری داوەری یەدەك ئەوەیە كە جێگیرەوەی یاریدەدەری داوەر یان داوەری چوارەم بگرێتەوە كە ناتوانێ بەردەوام بێت.

5. هێماكانی یاریدەدەری داوەری (Assistant referee signals):



لێدانی ئازاد بۆ بەرگری



لێدانی ئازاد بۆ هێرشبەر


كاری ئاڵوگۆڕین



هەڵدانی تەنیشت بۆ بەرگری



هەڵدانی تەنیشت بۆ هێرشبەر



لێدانی گۆڵ (ماڵی گۆڵ)



لێدانی گۆشە (كۆرنە)




ئۆفساید




ئۆفسایدی نزیك له یاریگا




ئۆفساید له ناوەڕاستی یاریگا




ئۆفسایدی دوور له یاریگا

6. هێماكانى یاریدەدەرى داوەرى یەدەك (Additional assistant referee signals):



## بەندی (7) ماوەی یاری (The Duration of the Match):

### 1. ماوەی یاری (Periods of play):

یاری بەردەوام دەبێت بۆ دوو تایمی وەك یەك وماوەكەی 45 خولەكە، ولەوانەیە ماوەی یاری كەم بكرێتەوە تەنها ئەگەر هەردوو تیپ وداوەر گەیشتنە رێك كەوتن پێش دەستپێكردنی یاری وبەپێی رێسای پێشبركییەكە.

### 2. ماوەی پشوودانی نێوان تایمەكان (Half-time interval):

یاریزانان مافی خۆیانە پشووی نێوان تایمەكانی هەبێت بەمەرجێ لە 15 خولەك زیاتر نەبێت. رێگە دەدرێت بە پشوویەكی كورت (كە نابێت لە یەك "1" خولەك زیاتر بێت) بە مەبەستی خواردنەوە (ئاو) لە پشووی نێوان هەردوو تایمی كاتی زیادكراو.

دەبێت رێسای پێشبركێ ئاماژە بدات بە ماوەی پشووی نێوان تایمەكان و دەتوانرێت گۆڕانكاری لە كاتی پشووی نێوان تایمەكان بكرێت تەنها بە رەزامەندی داوەر.

### 3. پێدانی كاتی بەفیرۆچوو (Allowance for time lost):

هەموو ئەو كاتانەی بەفیرۆچوون دەخرێتە سەر كاتی یاری لەلایەن داوەرەوە بۆ هەر تایمێكی یاری بە هۆی:

- كاری ئاڵوگۆڕین.
- هەڵسەنگاندن و/یان دوورخستنەوەی یاریزانانی پێكراو.
- بەفیرۆدانی كات (كوشتنی كات).
- كاری سەرزەنشتی (پێدانی كارتی زەرد وسوور).
- وەستانی یاری بۆ خواردنەوە (ئاو) (كە نابێت لە یەك "1" خولەك زیاتر بێت) یان بۆ هۆكاری پزیشكی تر كە رێگە پێدراوە لە رێسای پێشبركییەكە.
- دواخستنی كە پەیوەندی هەیە بە پشكنین وپێداچوونەوەی ڤیدیۆی VAR.
- هەر هۆیەكی تر، ئەمە هەر دواخستنێكی زۆری دەستپێكردنەوەی یاری دەگرێتەوە (بۆ نموونە: ئاهەنگ دەربڕین دوای تۆماركردنی گۆڵ).

داوەری چوارەم ئاماژە بە كەمترین كاتی زیادە دەكات كاتێك داوەر بڕیاری لێ دەدات لە دوا سات لە خولەكی كۆتایی هەر تایمێك. كاتی زیادكراو لەوانەیە زیاد بكرێت لەلایەن داوەرەوە بەڵام هەرگیز كەم ناكرێتەوە.

كاتێك داوەر هەڵە دەكات لە كاتی تایمی یەكەم ئەوا داوەر نابێت قەرەبووی كات بكاتەوە ئەوەش بە گۆڕینی ماوەی (كاتی) تایمی دووەم.

### 4. لێدانی سزا (Penalty kick):

ئەگەر هاتوو لێدانی سزا ئاماژە كرا یان لێدانی سزا دووبارەكرایەوە ئەوا ئەو تایمە دەبێت درێژبكرێتەوە هەتا لێدانی سزا كۆتایی دێت.

### 5. یاری هەڵپەسێردراو (تەواونەكراو) (Abandoned match):

دەبێت یاری هەڵپەسێردراو (تەواونەكراو) دووبارە بكرێتەوە مەگەر بە پێچەوانەوە رێسای پێشبركییەكە یان رێكخەرانی پاڵەوانێتییەكە ئاماژەی بە دەقێكی تر كرد بێت.

بەندی (8) سەرەتا ودەستپێکردنەوەی یاری (The Start and Restart of Play):

لێدانی سەرەتا بریتیە لە سەرتایەك بۆ هەردوو تایمی یاری وتایمەکاتی کاتی زیادکراو وبۆ دەستپێکردنەوەی یاری دوای تۆمارکردنی گۆڵ. بۆ لێدانی ئازاد (ڕاستەوخۆ وناڕاستەوخۆ) ولێدانی سزا ولێدانی گۆڵ (ماڵی گۆڵ) وهەڵدانی تەنیشت ولێدانی گۆشە (کۆرنە) دەستپێکردنەوەی یاری تری هەیە (سەیری بەندەکانی 13 هەتا 17 بکە). بەردانەوەی تۆپ ڕێگایەکە بۆ دەستپێکردنەوەی یاری، کاتێ داوەر یاری دەوەستێنێت ویاسای یارییەکە ئاماژەی بە یەکێك لەو دەستپێکردنەوانەی یاری سەرەوە ناکات.

ئەگەر سەرپێچییەك ڕوویدا کاتێ تۆپ لە دەرەوەی یاری بوو ئەوا چۆنێتی دەستپێکردنەوەی یاری ناگۆڕێت.

1. لێدانی سەرتا (Kick-off):

چۆنێتی جێبەجێکردن (Procedure):

- ئەو تیپەی تیروپشك دەباتەوە بڕیار دەدات کە گۆڵە هەڵبژێرێت کە لە تایمی یەکەم هێرشی بۆ دەکات (واتە یاریگا هەڵدەبژێرێت).
- تیپەکەی بەرامبەری لێدانی سەرەتا ئەنجام دەدات.
- ئەو تیپەی تیروپشکی بردەوە ئەوا هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی لێدانی سەرەتا لە تایمی دووەمدا.
- لە تایمی دووەمی یاری هەر دوو تیپ سەر دەگۆڕنەوە وهێرش دەکەنە سەر گۆڵی یەکتری.
- دوای تۆمارکردنی گۆڵ لەلایەن یەکێ لە تیپەکان، ئەوا تیپەکەی تر لێدانی سەرەتا ئەنجام دەدات.

بۆ هەر لێدانێکی سەرەتا:

- هەموو یاریزانان، جگە لەو یاریزانەی لێدانی سەرەتا جێبەجێ دەکات دەبێت لە نیوەی یاریگای تایبەت بە خۆیان بن.
- دەبێت یاریزانانی تیپی بەرامبەر ماوەی 9.15 م (10 یاردە) لە تۆپەوە دوور بن هەتا تۆپ دەکەوێتە یارییەوە.
- دەبێت تۆپ بە شێوەیەکی وەستاو دانرابێت لەسەر نیشانەی ناوەڕاست.
- داوەر ئاماژە بە دەستپێکردنی یاری دەدات.
- تۆپ دەچێتە یارییەوە کاتێ تۆپ جوڵا یان لێدرا بە شێوەیەکی ئاشکرا.
- دەتوانرێت ڕاستەوخۆ لە لێدانی سەرەتا گۆڵ تۆمار بکرێت لە دژی گۆڵی بەرامبەر؛ ئەگەر تۆپ یەکسەر چووە نێو گۆڵی تیپی لێدەری سەرەتا ئەوا لێدانی کۆرنە (گۆشە) دەدرێتە تیپی بەرامبەر.

سەرپێچییەکان وسزادان (Infringements and sanctions):

ئەگەر ئەو یاریزانەی لێدانی سەرەتا ئەنجام دەدات، جارێکی تر یاری بە تۆپ کرد پێش ئەوەی بەر یاریزانێکی تر بکەوێت ئەوا دەبێتە لێدانی ناڕاستەوخۆ یان لێدانی ڕاستەوخۆ ئەگەر تۆپی بە دەست گرت بە ئەنقەست.

لە حاڵەتی هەر سەرپێچییەکی تر دەربارەی چۆنێتی جێبەجێکردنی لێدانی سەرەتا ئەوا لێدانی سەرەتا دووبارە دەکرێتەوە.

2. بەردانەوەی تۆپ (Dropped ball):

### چۆنێتی جێبەجێکردن (Procedure):

داوەر هەڵدەستێت بە بەردانەوەی تۆپ لەو شوێنەی کە تۆپەکەی لێ بوو کاتێ یاری لێ وەستێنرا، مەگەر یارییەکە لە ناوچەی گۆڵ وەستێنرا لەم حاڵەتەدا داوەر هەڵدەستێت بە بەردانەوەی تۆپ لەسەر هێڵی ناوچەی گۆڵ تەریب بە هێڵی گۆڵ لە نزیکترین خاڵ لەو شوێنەی کە تۆپەکەی لێ بوو کاتێ یاری لێ وەستێنرا.

هەر ئەوەندە تۆپ بەر زەوی کەوت ئەوا تۆپ دەچێتە یارییەوە.

دەکرێت هەر ژمارەیەك لە یاریزانان بەرەنگاری ببنەوە لە کاتی بەردانەوەی تۆپ (گۆڵپارێزیش دەگرێتەوە)؛ داوەر ناتوانێت بڕیار بدات کێ بۆی هەیە بەرەنگاری بەردانەوەی تۆپ ببێتەوە یان بڕیار بدات لە دەرەنجامی بەردانەوەی تۆپ.

### سەرپێچییەکان وسزادان (Infringements and sanctions):

بەردانەوەی تۆپ دوو بارە دەکرێتەوە ئەگەر تۆپەکە:

- بەر یاریزان بکەوێت پێش ئەوەی بەر زەوی بکەوێت.
- بچێتە دەرەوەی یاریگا دوای ئەوەی تۆپ بەر زەوی دەکەوێت بەبێ ئەوەی بەر یاریزان بکەوێت.

ئەگەر بەردانەوەی تۆپ بچێتە گۆڵەوە بەبێ ئەوەی بەلایەنی کەمەوە بەر دوو یاریزان بکەوێت ئەوا یاری دەستپێدەکاتەوە بە:

- لێدانی گۆڵ (ماڵی گۆڵ) ئەگەر تۆپەکە بچێتە گۆڵی بەرامبەر.
- لێدانی گۆشە (کۆرنە) ئەگەر تۆپەکە بچێتە گۆڵی تیپی خۆیانەوە.

## بەندی (9) تۆپ لە نێو یاری ولە دەرەوەی یاری (The Ball in and Out of Play):

1. تۆپ لە دەرەوەی یاری (Ball out of play):

تۆپ لە دەرەوەی یاری دەژمێردرێت کاتێك:

- تۆپ بە هەموو قەبارەیەوە هێڵی گۆڵ یان هێڵی تەنیشت ببڕی لە سەر زەوی یان لە هەوا دا بێت.
- یاری دەوەستێنرێت لە لایەن داوەرەوە.

2. تۆپ لە نێو یاری (Ball in play):

لە هەموو کاتەکانی تر تۆپ لە نێو یارییە ئەمە ئەوش دەگرێتەوە کاتێ تۆپ دەگەڕێتەوە لە داوەرانی یاری یان ئەستوونی گۆڵەکە یان ڕاجەکە یان وەستاوی ئاڵای گۆشە و دەمێنێتەوە لە نێو یاریگادا.

## بەندی (10) دیاریكردنی دەرئەنجامی یاری (Determining the Outcome of a Match):

### 1. ئەژماركردنی گۆڵ (Goal scored):

بە گۆڵ دەژمێردرێت كاتێ تۆپ بە تەواوەتی وبە هەموو قەبارەیەوە بەسەر هێڵی گۆڵ تێ دەپەڕێت لە نێوان هەردوو ئەستوونی گۆڵ ولە ژێر ڕاجەكە بەمەرجێ ئەو تیپەی كە گۆڵی تۆماركرد هیچ هەڵەیەك یان سەرپێچییەكی لە یاسای یارییەكە ئەنجام نەكردبێت.

ئەگەر داوەر ئاماژەی بە تۆماركردنی گۆڵ دا پێش ئەوەی تۆپ بە تەواوەتی بەسەر هێڵی گۆڵ تێ پەڕێت ئەوا یاری دەست پێدەكاتەوە بە بەردانەوەی تۆپ.

### 2. تیپی براوە (Winning team):

ئەو تیپەی كە زۆرترین گۆڵ تۆمار بكات ئەوا براوەیە. ئەگەر هەردوو تیپ گۆڵیان تۆمارنەكرد یان یەكسان بوون لە ژمارەی تۆماركردنی گۆڵ ئەوا یارییەكە بە یەكسان ئەژمار دەكرێت.

كاتێ ڕێسای پاڵەوانێتیەكە جەخت لە سەر دیاریكردنی تیپی براوە دەكات لەو یارییەی كە كۆتایی هات بە یەكسانی یان دوای یاری چوون وگەڕانەوە ئەوا تەنها ئەو كارانەی كە ڕێگە پێدراون بۆ دیاریكردنی تیپی براوە بریتین لە:

- یاسای گۆڵەكان لە دەرەوەی یاریگای تیپ.
- دوو (2) تایمی یەكسانی زیادكراو كە نابێت لە 15 خولەك تێپەر بێت.
- لێدانی سزای یەكلاكەرەوە لە خاڵی سزاوە.

دەكرێت كۆمەڵێ لە ڕێساكانی سەرەوە بەكاربهێنرێت پێكەوە.



### 3. لێدانی سزای یەكلاكەرەوە لە خاڵی سزاوە (Kicks from the penalty mark):

لێدانی سزای یەكلاكەرەوە لە خاڵی سزاوە جێبەجێ دەكرێت پاش ئەوەی یاری كۆتایی هات بە یەكسانی و مەگەر بە پێچەوانەی بەندێك هەبێت كە پەیوەندی بە یاسای یارییەكەوە بێت بۆ ئەوەی جێبەجێ بكرێت.

### چۆنێتی جێبەجێكردن (Procedure):

#### پێش دەستپێكردنی لێدانی سزای یەكلاكەرەوە (Before kicks from the penalty mark start)

- جگە لەوەی ئەگەر هاتوو حاڵەتێكی تر نەبێت (بۆ نموونە: حاڵەتی زەوی یاریگا، سەلامەتی....هتد)، ئەوا داوەر هەڵدەستێت بە تیروپشك بۆ بڕیاردان لەوەی لە كام گۆڵ لێدانی سزا جێبەجێ بكرێت كە تەنها لەوانەیە بگۆڕدرێت لەبەر هۆكاری سەلامەتی یان ئەگەر گۆڵ یان ڕووكەشی یاریگاكە بۆ بەكارهێنان نەشیاو بێت.
- داوەر هەڵدەستێت بە تیروپشك بۆ جارێكی تر وئەو تیپەی تیروپشكەكەی بردەوە بڕیار دەدات كە لێدانی سزای یەكەم یان دووەم جێبەجێ بكات.
- جگە لەو یاریزانە یەدەكەی كە جێی گۆڵپارێز دەگەرێتەوە كە ناتوانێت بەردەوام بێت ئەوا تەنها ئەو یاریزانانەی كە لە نێو یاریدا بوون یان ئەو یاریزانانەی بە شێوەیەكی كاتی لە دەرەوەی یاریگادا بوون (یاریزانی پێكراو یان بۆ چاككردنەوەی كەرەستەكانیان....هتد) لە كاتی تەواو بوونی یاری ئەوا بۆیان هەیە لێدانی سزا ئەنجام بدەن.
- هەر تیپێك لێپرسراوە لە هەڵبژاردنی یاریزانانی شیاو بۆ ئەو ڕیزبەندیەی كە لێدانەكان ئەنجام دەدەن. پێویست ناكات داوەر ئاگادار بكرێتەوە لە ڕیزبەندی لێدانی یاریزانان.
- ئەگەر لە كاتی تەواو بوونی یاری و پێش یان لەكاتی لێدانی سزاكان تیپێك ژمارەی یاریزانانی زیاتر بوو لە تیپی بەرامبەر، ئەوا دەبێت ژمارەی یاریزانانی كەم بكاتەوە وەك هەمان ژمارەی یاریزانانی بەرامبەر وپێویست دەكات داوەر ئاگادار بكرێتەوە لە ناو وژمارەی هەر یاریزانێكی دوورخراو. هەر یاریزانێك دوور بخرێتەوە ئەوا بۆی نیە یان شیاو نیە بۆ جێبەجێكردنی لێدانی سزا (جگە لەوەی لە خاڵی خوارەوە ئاماژەی پێكراوە).
- ئەو گۆڵپارێزەی كە ناتوانێت بەردەوام بێت پێش یان لەكاتی لێدانی سزای یەكلاكەرەوە ئەوا دەتوانرێت بگۆڕدرێت بە ئەو یاریزانەی كە دوورخراوەتەوە بۆ یەكسانی ژمارەی یاریزانان هەردوو تیپ یان بگۆڕدرێت بە یاریزانێكی یەدەكی ناونووسكراو ئەگەر تیپەكەی ژمارەی ئاڵوگۆڕێنی تەواو نەبووبێت، بەڵام گۆڵپارێزی گۆڕاو بەشداری تری پێ ناكرێت ونابێت لێدانی سزای ئەنجام بدات.
- <u>ئەگەر گۆڵپارێز لێدانی سزای جێبەجێ كرد پێشتر ئەوا گۆڵپارێزی گۆڕدراو بۆی نیە لێدانی سزا جێبەجێ بكات هەتا دەورەی داهاتووی لێدانی سزای یەكلاكەرەوە.</u>

#### لە كاتی لێدانی سزای یەكلاكەرەوە (During kicks from the penalty mark)

- تەنها ڕێگە دەدرێت بە داوەرانی یاری وئەو یاریزانانەی كە مافی لێدانی سزایان هەیە لە نێو یاریگادا بمێننەوە.
- جگە لە یاریزانی لێدەری سزا وهەر دوو گۆڵپارێز، ئەوا دەبێت هەموو ئەو یاریزانانەی كە مافی لێدانی سزایان هەیە لە نێو بازنەی ناوەڕاستی یاریگادا بمێننەوە.
- دەبێت گۆڵپارێزی ئەو تیپەی لێدانی سزا ئەنجام دەدات لە نێو یاریگادا بمێنێتەوە ولە دەرەوەی ناوچەی سزا لەسەر هێڵی گۆڵ لە خاڵی بەیەك گەیشتنی لەگەڵ هێڵی ناوچەی سزا.
- ئەو یاریزانەی كە مافی لێدانی سزای هەیە دەتوانێت شوێنی بگۆڕێتەوە لەگەڵ گۆڵپارێز.
- لێدانی سزاكە تەواو دەبێت كاتێ تۆپەكە دەوەستێت لە جوڵەكردن یان تۆپەكە دەچێتە دەرەوەی یاری یان داوەر یاری دەوەستێنێت لەبەر هەر سەرپێچییەك: ڕێگە نادرێت بە لێدەری سزا كە یاری بە تۆپ بكاتەوە جارێكی تر.
- داوەر هەڵدەستێت بە تۆماركردنی لێدانەكان.
- ئەگەر گۆڵپارێز هەستا بە ئەنجامدانی سەرپێچی ولە دەرئەنجامدا لێدانی سزاكە دووبارە كرایەوە ئەوا دەبێت گۆڵپارێز ئاگادار بكرێتەوە (بەكارتی زەرد).
- ئەگەر سزای لێدەری سزا درا لەبەر ئەنجامدانی سەرپێچی لە دوای ئەوەی داوەر ئاماژەی دا بۆ جێبەجێ كردنی سزاكە ئەوا ئەو لێدانەكە دەفەوتێ ویاریزانەكە ئاگادار دەكرێتەوە (بەكارتی زەرد).
- ئەگەر هەردوو گۆڵپارێز ولێدەری سزا سەرپێچیان ئەنجامدا لەهەمان كاتدا، ئەوا:

- ئەگەر لە لێدانەكە گۆڵ تۆمارنەكرا (واتە فەوتا) یان رزگاركرا ئەوا لێدانی سزاكە دووبارە دەكرێتەوە وهەردوو یاریزان ئاگاردەكرێنەوە (بەكارتی زەرد).
- ئەگەر لە لێدانەكە گۆڵ تۆماركرا ئەوا گۆڵەكە ئەژمار ناكرێت ولێدانەكە دەفەوتێ ولێدەری سزا ئاگاداردەكرێتەوە (بەكارتی زەرد).

### بەپێی ئەو مەرجانەی ڕوونكراوەتەوە لە خوارەوە، ئەوا هەردوو تیپ هەڵدەستن بە لێدانی 5 لێدانی سزا

(Subject to the conditions explained below, both teams take five kicks)

- لێدانی سزاكان بەنۆرە لەلایەن هەر دوو تیپەوە ئەنجام دەدرێت.
- ئەگەر پێش ئەوەی هەردوو تیپ 5 لێدانەكە لێ بدەن، ئەوا تیپێكیان گۆڵی زیاتر تۆماركرد لە تیپەكە تر (واتە تیپێك ئەوەندەی گۆڵ هەبوو كە تیپی بەرامبەر نەیتوانی تۆماری بكات) تەنانەت ئەگەر هاتوو تیپەكەی تر ویستی 5 لێدانەكە تەواو بكات ئەوا لێدانەكانی تر ئەنجام نادرێت.
- ئەگەر هاتوو دوای ئەوەی هەردوو تیپ 5 لێدانی سزایان ئەنجامدا و یەكسان بوون لە گۆڵ ئەوا لێدانەكان بەردەوام دەبێت هەتا تیپێك گۆڵی زیاتر تۆمار دەكات لە تیپەكەی تر.
- هەر لێدانێك لەلایەن یاریزانێكی جیاواز ئەنجام دەدرێت وهەموو ئەو یاریزانانەی كە مافی لێدانی سزایان هەیە دەبێت لێدانی سزا ئەنجام بدەن پێش ئەوەی هەر یاریزانێك لێدانی سزا دووبارە بكاتەوە.
- پرنسیپی سەرەوە بۆ هەر ڕیزبەندیەكی دواتر بەردەوام دەبێت بەڵام تیپەكان لەوانەیە ڕیزبەندی لێدانەكان بگۆڕن.
- لێدانی سزای یەكلاكەرەوە نابێت دوابخرێت لەبەر ئەوەی یاریزانێك چۆتە دەرەوەی یاریگا. یاریزان لێدانەكەی لەدەست دەدات (واتە تۆمار ناكرێت) ئەگەر هاتوو یاریزانەكە نەگەڕایەوە لە كاتی لێدانی سزاكەی.

### یاریزانە یەدەكەكان ویاریزانە دەركراوەكان لە كاتی لێدانی سزای یەكلاكەرەوە:

(Substitutions and send offs during kicks from the penalty mark)

- یاریزان یان یاریزانی یەدەك یان یاریزانی گۆڕاو لەوانەیە ئاگاداربكرێتەوە (بە كارتی زەرد) یان دەربكرێت (بە كارتی سوور).
- ئەو گۆڵپارێزەی كە دەردەكرێت بە كارتی سوور ئەوا دەبێت یاریزانێكی شیاو شوێنی بگرێتەوە.
- ئەو یاریزانەی (جگە لە گۆڵپارێز) نەیتوانی بەردەوام بێت ئەوا ناتوانرێت یەكێكی تر شوێنی بگرێتەوە.
- داوەر نابێت یاری هەڵپەسێردراو بكات (تەواو بكات) ئەگەر تیپێك ژمارەی یاریزانانی لە 7 یاریزان كەمتر بوو.




لێدان لە خاڵی سزاوە (لێدانی یەكلاكەرەوە)

## بەندی (11) ئۆفسايد (Offside):

### 1. شوێنی ئۆفسايد (Offside position):

وەستان لە ئۆفسايد خۆی لەخۆیدا سەرپێچی نیە.

ياريزان لە ئۆفسايد ئەژمار دەكرێت ئەگەر:

- هەر بەشێك لە سەری يان لەشی يان پێ ی لە بەشی نیوەی ياريگای تيپی بەرامبەر بێت (جگە لە هێڵی ناوەڕاست) و
- هەر بەشێك لە سەری يان لەشی يان پێ ی نزيكتر بێت لە هێڵی گۆڵی بەرامبەر لە هەردوو تۆپ و دووەم-دوايين ياريزانی بەرگری.

هەردوو دەست وقۆڵی هەموو ياريزانان بە گۆڵپارێزیشەوە ڕەچاو ناكرێت (يان ئەژمار ناكرێت) لە ئۆفسايدا.

ياريزان لە ئۆفسايد نابێت ئەگەر لە يەك ئاست بێت لەگەڵ:

- دووەم-دوايين ياريزانی بەرگری. يان
- دوايين هەردوو ياريزانی بەرگری.

### 2. سەرپێچی ئۆفسايد (Offside offence):

ياريزان لە ئۆفسايد دەبێت لەو ساتەی كە ياری بە تۆپ دەكات يان بەر(*) تۆپ دەكەوێت لە لايەن ياريزانی تيپەكەی خۆی وسزا دەدرێت تەنها لەبەر بەشداريكردنی لە ياری چالاك بەهۆی:

- دەستێوەردان لە ياری واتە بەركەوتن يان ياريكردن بەو تۆپەی كە بەريكەوت يان پێدرا لەلايەن ياريزانی تيپەكەی خۆی.
- دەستێوەردان لەگەڵ ياريزانی بەرامبەر بەهۆی:
  - نەهێشتنی ياريزانی بەرامبەر بۆ ياريكردن يان نايەڵێت توانای ياريكردنی هەبێت ئەوەش بە داپۆشينی هێڵی بينينی بەرامبەر بەڕوونی. يان
  - ڕكابەرێتی ياريزانی بەرامبەر بۆ تۆپ. يان
  - بە ئاشكرا هەوڵ دەدات بۆ ياريكردنی ئەو تۆپەی كە نزيكە كاتێ ئەم كارە كاريگەريی دەكاتە سەر ياريزانی بەرامبەر. يان
  - هەڵدەستێت بە كارێك كە بە ئاشكرا كاريگەريی دەكاتە سەر توانای ياريزانی بەرامبەر بۆ ياريكردنی تۆپ.

يان

- بەدەستهێنانی سوود بە ياريكردنی تۆپ يان دەستێوەردان لەگەڵ ياريزانی بەرامبەر كاتێ:
  - تۆپ دەگەڕێتەوە لە ئەستوونی گۆڵ يان ڕاجە يان داوەرانی ياری يان ياريزانی بەرامبەر.
  - تۆپ بە ئەنقەست رزگار كرا لەلايەن هەر ياريزانێكی بەرامبەر.

ئەو ياريزانەی كە لە ئۆفسايد وەستاوە، تۆپ وەردەگرێت لە ياريزانی بەارمبەر بە ئەنقەست ئەوا ئەژمار ناكرێت كە سوودی وەرگرتووە (جگە لە رزگاركردنی تۆپ بە ئەنقەست لەلايەن هەر ياريزانێكی بەرامبەر).

"رزگاركردن" ئەوەيە كاتێك ياريزان هەڵدەستێت بە وەستان يان هەوڵدان بۆ وەستانی ئەو تۆپەی كە دەڕوات بۆ گۆڵ يان زۆر نزيكە لە گۆڵ بە هەر بەشێك لە لەشی جگە لە دەست/قۆڵ (ئەمە گۆڵپارێز ناگرێتەوە لە ناوچەی سزای خۆی).

(*) دەبێت يەكەم خاڵی پەيوەندی بەركەوتن لە "ياريكردن" يان "بەركەوتنی" تۆپەكە بەكاربهێنرێت.

### 3. سەرپێچی نیە (No offence):

**ئۆفسايد نيه ئەگەر ياريزان يەكسەر تۆپ وەربگرێت لە:**

- **لێدانی گۆڵ (ماڵی گۆڵ).**
- **هەڵدانی تەنيشت.**
- **لێدانی گۆشە (كۆڕنە).**

### 4. سەرپێچييەكان وسزادان (Offences and sanctions):

**ئەگەر ئۆفسايد ڕوويدا، ئەوا داوەر لێدانی ناڕاستەوخۆ ئەژمار دەكات لەو شوێنەی كە سەرپێچييەكەی لێ ئەنجامدرا، ئەمە ئەوەش دەگرێتەوە ئەگەر هاتوو ياريزان لە بەشی نيوەی ياريگای خۆی بێت.**

**ئەو ياريزانە بەرگرييەی كە ياريگا بەجێ دەهێڵێت بەبێ پرسی داوەر ئەوە دەبێت وادابنرێت كە لەسەر هێڵی گۆڵ يان هێڵی تەنيشت وەستاوە بە مەبەستی ئۆفسايد هەتا وەستانی داهاتووی ياری يان هەتا تيپی بەرگری ياری بە تۆپ دەكات بەرەو هێڵی ناوەڕاست و لە دەرەوەی ناوچەی سزا. ئەگەر ياريزان ياريگای بەجێ بهێڵێت بە ئەنقەست ئەوا ئەو ياريزانە دەبێت ئاگادار بكرێتەوە (بە كارتی زەرد) كاتێ تۆپی داهاتوو دەچێتە دەرەوەی ياری.**

**ياريزانی هێرشبەر لەوانەيە هەنگاو بنێت يان بچێتە دەرەوەی ياريگا بۆ ئەوەی بەشداری ياری چالاك نەكات. ئەگەر ئەو ياريزانە جارێكی تر هاتەوە نێو ياريگا لە هێڵی گۆڵەوە وبەشداری ياری كرد پێش ئەوەی ياری بوەستێت يان تيپی بەرگری ياری بە تۆپ دەكات بەرەو هێڵی ناوەڕاست و لە دەرەوەی ناوچەی سزا. ئەو ياريزانە دەبێت ئەژمار بكرێت كە لەسەر هێڵی گۆڵ وەستاوە بە مەبەستی ئۆفسايد.**

**ئەو ياريزانەی كە بە ئەنقەست ياريگا بەجێ دەهێڵێت يان جارێكی تر دێتەوە نێو ياريگا بەبێ پرسی داوەر و سزا نەدرا بە ئۆفسايد لەبەر بەدەستهێنانی سوود، ئەوا دەبێت ئاگاداربكرێتەوە بە كارتی زەرد.**

**ئەگەر ياريزانی هێرشبەر بە جێگيری مايەوە لە نێوان ئەستوونی گۆڵ و لە ناو گۆڵەكە (ناو تۆڕی گۆڵ) كاتێ تۆپەكە دەچێتە گۆڵەوە، ئەوا ئەو گۆڵە ئەژمار دەكرێت جگە لەوەی ئەو ياريزانە سەرپێچی ئۆفسايد ئەنجام بدات يان سەرپێچی لە بەندی 12 دا بكات لەم حاڵەتە ياری دەستپێدەكاتەوە بە لێدانی ناڕاستەوخۆ يان ڕاستەوخۆ.**

## بەندی (12) هەڵە وبەد ڕەفتاری (Fouls and Misconduct):

لێدانی ڕاستەوخۆ وناڕاستەوخۆ ولێدانی سزا دەدرێت تەنها بۆ ئەنجامدانی هەڵە وسەرپێچییەكان كاتێ تۆپ لە یارییدایە.

### 1. لێدانی ڕاستەوخۆ (Direct free kick):

لێدانی ڕاستەوخۆ دەدرێت ئەگەر یاریزان هەر یەك لەم سەرپێچییانەی لای خوارەوە ئەنجام بدات دژی یاریزانی بەرامبەر كە بە بڕوای داوەر بە شێوەیەكی كەمتەرخەم یان هەڵەشەیی یان بەكارهێنانی هێزێكی زیاتر لە پێویست بێت:

- شان (بەكارهێنانی شان بە شێوەكی نایاسایی).
- بازدان.
- تێهەڵدان یان هەوڵدان بۆ تێهەڵدان.
- پاڵنان.
- لێدان یان هەوڵدان بۆ لێدان (لێدان بە سەریش دەگرێتەوە).
- هێرش كردن یان بەرەنگاری بوونەوە.
- بەرهەڵست (كۆسپ) یان هەوڵدان بۆ بەرهەڵست كردن.



ئەگەر سەرپێچیەكە بەركەوتنی تێدا بوو ئەوا سزا دەدرێت بە لێدانی ڕاستەوخۆ یان لێدانی سزا.

### كەمتەرخەم، هەڵەشەیی، بەكارهێنانی هێزێكی زیاتر لە پێویست (Careless, reckless, using excessive force):

**"كەمتەرخەم":** ڕوو دەدات كاتێ یاریزان كەمێ گرنگی پێنەدان یان ڕەچاو نەكردن دژی ڕكابەرەكەی ئەنجام دەدات كاتێ بەرەنگار دەبێتەوە یان هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی كارێكی بێ ووریایی. هیچ سزایەكی سەرزەنشتی پێویست ناكات.

**"هەڵەشەیی":** ڕوو دەدات كاتێ كرداری یاریزان بە گوێی پێ نەدان بۆ مەترسی ڕكابەرەكەی یان لە دەرەنجامی كارەكەی دژی ڕكابەرەكەی ودەبێت ئاگادار بكرێتەوە (بە كارتی زەرد).

**"بەكارهێنانی هێزێكی زیاتر لە پێویست":** ڕوو دەدات كاتێ یاریزان لە ڕادەی خۆی تێپەر دەبێت لە بەكارهێنانی هێز وسەلامەتی ڕكابەرەكەی تووشی مەترسی دەكات، ودەبێت دەربكرێت (بە كارتی سوور).

لێدانی ڕاستەوخۆ دەژمێردرێت ئەگەر یاریزان هەر یەكێ لەم سەرپێچییانەی خوارەوە ئەنجام بدات:

- گرتنی تۆپ بە دەستی ئەنقەست (جگە لە گۆڵپارێز لە ناوچەی سزای خۆی).
- گرتنی بەرامبەر.
- ڕێگرتن لە پێشكەوتنی بەرامبەر لەگەڵ بەركەوتن.
- گازگرتن یان تف كردن لە كەسێك.
- هەڵدانی شتێك بۆ تۆپ یان بەرامبەر یان داوەرانی یاری یان هەڵدەستێ بە بەركەوتن لەگەڵ تۆبدا بە شتێك كە بەدەستێوەیەتی.

هەروەها سەیری سەرپێچییەكانی بەندی 3 بكە.

### گرتنی تۆپ (Handling the ball):

**گرتنی تۆپ واته هەستانی یاریزان بە کردارێکی ئەنقەست بۆ بەرکەوتن لەگەڵ تۆپدا بە دەستی یان بە قۆڵی (واتە گرتنی تۆپ بە ئەنقەست).**

**دەبێت ئەم خاڵانەی خوارەوە ڕەچاو بکرێت:**

- **جوڵەی دەست بەرەو تۆپ (نەك جوڵەی تۆپ بەرەوە دەست).**
- **ماوەی نێوان تۆپ وياريزانی بەرامبەر (تۆپێکی چاوەڕوان نەکراو).**
- **شوێنی دەست مانای ئەوە نیە کە سەرپێچیەك هەیە.**
- **بەرکەوتنی (یان گرتنی) تۆپ بە شتێك کە بە دەستیەوە بێت (جل وبەرگ، پارێزەری ئێسکی قاچ....هتد) بە سەرپێچی دادەنرێت.**
- **بەرکەوتنی تۆپ بە فڕێدانی شتێك (پێڵاو، پارێزەری ئێسکی قاچ....هتد) بە سەرپێچی دادەنرێت.**

**گۆڵپارێز لە کاتی گرتنی تۆپ لە دەرەوەی ناوچەی سزای خۆی هەمان مەرجی سەپێنراوی لەسەرە وەك چۆن لە سەر یاریزانانی تر سەپێنراوە. لە نێو ناوچەی سزای خۆی گۆڵپارێز تاوانبار نابێت بە سەرپێچی گرتنی تۆپ بە دەست کە خۆی لە خۆیدا سزاکەی لێدانی ڕاستەوخۆیە یان هەر سزایەك کە پەیوەندی بە گرتنی تۆپەوەیە یان هەر سزایەکی سەرزەنشتی بەڵام دەکرێت تاوانبار بێت بە سەرپێچی گرتنی تۆپ بە دەست کە دەبێتە لێدانی ناڕاستەوخۆ.**

### 2. لێدانی ناڕاستەوخۆ (Indirect free kick):

**لێدانی ناڕاستەوخۆ ئەژمار دەکرێت ئەگەر یاریزان:**

- **هەستێت بە یاریکردن بە شێوەیەکی ترسناك.**
- **هەستێت بە ڕێگرتن لە پێشکەوتنی یاریزانی بەرامبەر بەبێ ڕوودانی هیچ بەرکەوتنێك.**
- **تاوانبار بێت بە نارەزایی بە بەکارهێنانی زمانی قێزەون یان تڕۆکردن یان نیشانەی جنێوفرش و بێرێزی یان هەر سەرپێچییەکی ووشەیەی ناشیاو.**
- **نایەڵێت گۆڵپارێز تۆپ هەڵ بدات بە دەستی یان بە پێ ی یان هەوڵدان بۆ لێدانی تۆپ کاتێ گۆڵپارێز لە کرداری هەڵدانی تۆپدایە (واتە دەرچوونی تۆپ).**
- **هەر سەرپێچیەکی تر ئەنجام بدات کە باس نەکرابێت لە یاسای تۆپی پێ دا وياری وەستێنرا بۆ ئاگادارکردنەوەی یاریزان ( بە کارتی زەرد) یان دەرکردن (بە کارتی سوور).**

**لێدانی ناڕاستەوخۆ ئەژمار دەکرێت ئەگەر گۆڵپارێز لە ناوچەی سزای خۆی هەستا بە ئەنجامدانی هەر یەکێ لەم سەرپێچییانەی خوارەوە:**

- **کۆنتڕۆڵ کردنی تۆپ بە دەستی بۆ زیاتر لە 6 چرکە پێش ئەوەی تۆپ هەڵ بدات.**
- **دەست لێدانی تۆپ پاش:**
  - **هەڵدانی تۆپ وپێش ئەوەی تۆپ بەر یاریزانێکی تر بکەوێت.**
  - **تۆپ بە ئەنقەست لێ بدرێت بۆ گۆڵپارێز لەلایەن یاریزانێکی هاوڕێی تیپەکەیەوە.**
  - **وەرگرتنی تۆپ لە هەڵدانی تەنیشتەوە لەلایەن یاریزانێکی هاوڕێی تیپەکەیەوە.**

**گۆڵپارێز وا دادەنرێت کە کۆنتڕۆڵی تۆپی کردووە کاتێ:**

- **تۆپ لە نێوان هەردوو دەستی یان لە نێوان دەست وهەر ڕوویەك بێت (بۆ نموونە زەوی، لەشی خۆی) یان لەلایەن دەست لێدانی تۆپ بەهەر بەشێکی دەست یان قۆڵ جگە لەوەی ئەگەر تۆپ بە ڕێکەوت بگەڕێتەوە لە گۆڵپارێز یان گۆڵپارێز تۆپ رزگار بکات.**
- **تۆپ دەگرێت بە دەستی کراوەی بڵاو (کاتێ لەشی درێژبۆتەوە و دەستی کراوەیە).**
- **هەڵدەستێت بە تەپ تەپەکردن لە سەر زەوی یان هەڵدانی بۆ هەوا.**

**نابێت بەرەنگاری گۆڵپارێز بکرێتەوە لەلایەن بەرامبەر کاتێ گۆڵپارێز کۆنتڕۆڵی تۆپ دەکات بە دەستی.**

**یاریکردن به‌ شێوەیەکی ترسناك (Playing in a dangerous manner):**

یاریکردن به‌ شێوەیەکی ترسناك واته‌ هەستان به‌ هەر كارێك كه‌ هەڕەشەی پێكانی كەسێك بکات کاتێك یاریزان بیەوێت یاری به‌ تۆپ بکات (ئەمه‌ یاریزانەکه‌ خۆشی دەگرێتەوه‌) وئەم كاره‌ ئەوەش دەگرێتەوه‌ كه‌ ڕێ بگرێت له‌ یاریزانی بەرامبەری تەنیشتی بۆ یاریکردنی تۆپ له‌ ترسی پێکان.

ڕێگه‌ دەدرێت به‌ لێدانی مقەستی یان دەبلێ به‌ مەرجێ مەترسی نەبێت له‌ سەر یاریزانانی بەرامبەر.

**ڕێگرتن له‌ پێشكەوتنی یاریزانی بەرامبەر بەبێ بەرکەوتن (Impeding the progress of an opponent without contact):**

ڕێگرتن له‌ پێشكەوتنی بەرامبەر واته‌ جوڵاندن بۆ ڕێچکەی یاریزانی بەرامبەر تا ڕای بگرێت یان بلۆکی بکات یان هێواشی بکاتەوه‌ یان ناچاری بکات ئاڕاستەکەی بگۆڕێت کاتێ تۆپ له‌ شوێنی یاریکردنی هیچ لەو دوو یاریزانه‌ نیه‌.

هەموو یاریزانان مافی بوونیان (یان وەستانیان) هەیه‌ له‌ هەر شوێنێکی یاریگادا بێت؛ بەڵام بوونیان له‌ ڕێگای یاریزانی بەرامبەر وەك ئەو حاڵەته‌ نیه‌ كه‌ بجوڵێ بۆ ڕێچکەی یاریزانی بەرامبەر.

یاریزان دەتوانێت پارێزگاری (حجزی) تۆپ بکات بەوەی شوێنێك هەڵبژێرێت له‌ نێوان یاریزانی بەرامبەر وتۆپەکه‌ ئەگەر هاتوو تۆپەکه‌ له‌ شوێنی یاریکردن بوو ویاریزانی بەرامبەری نەگرتبێت به‌ قۆڵی یان به‌ لەشی. ئەگەر تۆپ له‌ شوێنی یاریکردن بوو ئەوا یاریزانی بەرامبەر دەتوانێت به‌ شێوەیەکی دروست شانه‌ خڕه‌ لەگەڵ یاریزان بکات.

**3. کاری سەرزەنشتی (Disciplinary action):**

داوەر دەسەڵاتی هەیه‌ له‌ هەر کارێکی سەرزەنشتی له‌ کاتی چوونه‌ ژوورەوەی بۆ نێو یاریگا <u>بۆ پشکنینی یاریگا پێش دەستێکردنی یاری</u> هەتا بەجێهێشتنی <u>یاریگا پاش تەواو بوونی یاری (لێدانی یەکلاکەرەوه‌ له‌ خاڵی سزاوه‌ دەگرێتەوه‌).</u>

<u>ئەگەر پێش چوونه‌ ژوورەوه‌ بۆ نێو یاریگا بۆ دەستپێکردنی یاری، یاریزانێك سەرپێچی ئەنجامدا كه‌ شایستەی دەرکردنه‌ (به‌ کارتی سوور) ئەوا داوەر دەسەڵاتی هەیه‌ له‌ بێ بەشکردنی ئەو یاریزانه‌ كه‌ بەشداری یاری نەکات (سەیری بەندی 3 برگەی 6 بکه‌)؛ داوەر هەڵدەستێت به‌ بەرزکردنەوەی ڕاپۆرت لەسەر هەر کارێکی بەد ڕەفتاری تر.</u>

ئەو یاریزانەی كه‌ سەرپێچی ئەنجام دەدات كه‌ شایستەی ئاگادارکردنەوەیه‌ (به‌ کارتی زەرد) یان دەرکردنه‌ (به‌ کارتی سوور) له‌ نێو یاریگادا بێت یان له‌ دەرەوەی یاریگا دژی یاریزانی بەرامبەر یان یاریزانی تیپەکەی خۆی یان داوەرانی یاری یان هەر کەسێکی تر یان یاسای یاری ئەوا سزا دەدرێت بەپێی سەرپێچییەکه‌.

مەبەست له‌ کارتی زەرد ئاگادارکردنەوەیه‌ ومەبەست له‌ کارتی سوور دەرکردنه‌.

کارتی زەرد یان کارتی سوور تەنها دەدرێت به‌ یاریزان یان یاریزانی یەدك یان ئەو یاریزانەی كه‌ دەگۆڕدرێت.

**دواخستنی دەستپێکردنەوەی یاری بۆ پێدانی کارت (Delaying the restart of play to show a card):**

هەر کاتێ داوەر بڕیاری دا یاریزان ئاگادار بکاتەوه‌ (به‌ کارتی زەرد) یان دەری بکات (به‌ کارتی سوور) ئەوا نابێت یاری دەستپێبکاتەوه‌ هەتا سزاکه‌ جێبەجێ دەکرێت.

**یاسای سوود بەخش (Advantage):**

**ئەگەر داوەر ئاماژەی دا بە یاسای سوود بەخش بۆ سەرپێچییەك كە دەبوایە ئاگادار بكرایەتەوە (بە كارتی زەرد) یان دەربكرایە (بە كارتی سوور) ئەگەر هاتوو یاری بوەستێنرایە بۆ پێدانی كارت، ئەم كارتە زەرد یان سوورە دەبێت جێبەجێ بكرێت كاتێ تۆپی داهاتوو دەچێتە دەرەوەی یاریگا، تەنها جگە لە كاتی نەهێشتنی هەلێكی ئاشكرا بۆ تۆماركردنی گۆڵ كە دەرئەنجامەكەی بوو بە گۆڵ ئەوا دەبێت یاریزان ئاگاداربكرێتەوە (بە كارتی زەرد) لەبەر ڕەفتاری ناوەرزشی.**

**نابێت یاسای سوود بەخش بەكار بهێنرێت لە حاڵەتی یاری مەترسیدار یان ڕەفتاری توندوتیژ یان سەرپێچی كارتی زەردی دووەم جگە تەنها لە كاتی هەلێكی ڕوون بۆ تۆماركردنی گۆڵ. داوەر دەبێت ئەو یاریزانە دەر بكات (بە كارتی سوور) كاتێ تۆپی داهاتوو دەچێتە دەرەوەی یاری بەڵام ئەگەر ئەو یاریزانە یاری بە تۆپ كرد یان بەرەنگاری/دەستێوەردانی یاریزانی بەرامبەری كرد ئەوا داوەر یاری دەوەستێنێت وئەو یاریزانە دەر دەكات (بە كارتی سوور) ویاری دەستپێدەكاتەوە بە لێدانی ناڕاستەوخۆ.**

**ئەگەر یاریزانی بەرگری هەستا بە گرتنی یاریزانی هێرشبەر لە دەرەوەی ناوچەی سزا وبەردەوام بوو لە گرتنی لە ناو ناوچەی سزا ئەوا دەبێت داوەر ئاماژە بدات بە لێدانی سزا.**

**سەرپێچییەكانی ئاگاداركردنەوە (بە كارتی زەرد) (Cautionable offences):**

**یاریزان ئاگادار دەكرێتەوە بە كارتی زەرد ئەگەر تاوانبار بوو بە:**

1. **دواخستنی دەستپێكردنەوەی یاری.**
2. **ناڕەزایی بە قسە یان بە كردەوە.**
3. **هاتنە ناو یاریگا یان دووبارە گەڕانەوە بۆ نێو یاریگا یان بەجێهێشتنی یاریگا بە ئەنقەست بەبێ پرسی داوەر.**
4. **ڕێزی ماوەی پێویست ناگرێت لە كاتی دەستپێكردنەوەی یاری بە لێدانی گۆشە (كۆڕنە) یان لێدانی ئازادی (ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ) یان هەڵدانی تەنیشت.**
5. **بەردەوام بوون لە سەرپێچی كردنی بەندەكانی یاسای تۆپی پێ (هیچ ژمارەیەكی دیاریكراو یان شێوازی سەرپێچییەكان نیە بۆ ئاماژەدان بە "بەردەوام بوون")**
6. **ڕەفتاری ناوەرزشی.**

**یاریزانی یەدەك یان یاریزانی گۆڕاو ئاگادار دەكرێتەوە بە كارتی زەرد ئەگەر تاوانبار بوو بە:**

1. **دواخستنی دەستپێكردنەوەی یاری.**
2. **ناڕەزایی بە قسە یان بە كردەوە.**
3. **هاتنە ناو یاریگا یان دووبارە گەڕانەوە بۆ نێو یاریگا بەبێ پرسی داوەر.**
4. **ڕەفتاری ناوەرزشی.**

### ئاگادارکردنەوە بۆ ڕەفتاری ناوەرزشیانە (Cautions for unsporting behaviour):

چەند بارودۆخێکی جیاواز هەیە کاتێك یاریزان دەبێت ئاگادار بکرێتەوە (بە کارتی زەرد) بۆ ڕەفتاری ناوەرزشی ئەمە ئەوەش دەگرێتەوە ئەگەر یاریزان:

- هەوڵ بدات بۆ فێڵ کردن لە داوەر بۆ نموونە: بە فێڵ کردنی پێکان یان خۆی وا پیشان دەدات کە هەڵەی (فاوڵی) لێکراوە (نواندن).
- شوێن خۆی بگۆڕێت لەگەڵ گۆڵپارێز لە کاتی یاری یان بەبێ پرسی داوەر.
- هەستێت بە ئەنجامدانی سەرپێچییەك بە شێوەیەکی هەڵەشەیی لە سەرپێچییەکانی لێدانی ڕاستەوخۆ.
- هەستێت بە ئەنجامدانی هەڵەیەك یان تۆپ بگرێت بە دەستی بۆ دەستێوەردان لە یاری یان وەستانی هێرشێکی بە سوود.
- دەست بۆ تۆپ بەرێ لە هەوڵێك بۆ تۆمارکردنی گۆڵ (ئەگەر بێتو هەوڵەکەی سەرکەوتوو بوو یان نا) یان هەوڵێکی سەرنەکەوتوو بۆ ڕێگرتن لە تۆمارکردنی گۆڵ.
- هەستێت بە دیاریکردنی نیشانەی ڕێگە پێنەدراو لە یاریگا.
- یاری بە تۆپ بکات کاتێ یاریگا بەجێ دەهێڵێت پاش وەرگرتنی ڕەزامەندی داوەر بۆ بەجێهێشتنی یاریگا.
- کەم ڕێزی پیشان بدات بەرامبەر یاسای یاری تۆپی پێ.
- فێڵێك بە ئەنقەست بەکاربهێنێت بۆ پاسدانی تۆپ (ئەمە لێدانی ڕاستەوخۆ وناڕاستەوخۆش دەگرێتەوە) بۆ گۆڵپارێز بە سەر یان سنگ یان ئەژنۆ ....هتد بۆ فێڵ کردن لە یاسا ئەگەر بێتو گۆڵپارێز دەستی بەر تۆپ بکەوێت یان نەکەوێت.
- بە زارەکی (بە قسە) سەرنجی بەرامبەر ڕابکێشێت لە کاتی دەستپێکردنەوەی یاری.

### ئاهەنگی دەربڕینی خۆشی گۆڵ (Celebration of a goal):

یاریزانان دەتوانن ئاهەنگ بگێڕن بۆ خۆشی تۆمارکردنی گۆڵ بەڵام دەربڕینی خۆشی گۆڵ نابێت زیادە ڕەوی پێوە دیار بێت؛ ونابێت هانی سەماکردن بە مەبەستی ئاهەنگی خۆشی گۆڵ بدرێت ونابێت ببێتە هۆکارێك بۆ بەفیڕۆدانی کاتێکی زۆر.

بەجێهێشتنی یاریگا بۆ ئاهەنگ دەربڕینی خۆشی گۆڵ خۆی لە خۆیدا سەرپێچییەکی ئاگادارکردنەوە نیە (بە کارتی زەرد) بەڵام یاریزانان دەبێت بگەڕێنەوە نێو یاریگا بە زووترین کات.

دەبێت یاریزان ئاگادار بکرێتەوە (بە کارتی زەرد) لەبەر:

- هەڵ گەڕان بەسەر بەربەستی چوار دەوری یاریگا.
- هەستان بە جوڵەیەك (ئاماژەیەك) بە شێوەیەکی تەشەرەنان یان وروژاندن یان هەست بزوێنەر.
- داپۆشینی سەر یان دەم وچاو بە دەمامك (قیناع) یان کەرەستەیەکی هاوشێوەی تر.
- داکەندنی درێسەکەی یان داپۆشینی سەری بە درێس.



### دواخستنی دەستپێکردنەوەی یاری (Delaying the restart of play):

دەبێت داوەران یاریزانان ئاگادار بکەنەوە (بە کارتی زەرد) بۆ دواخستنی دەستپێکردنەوەی یاری بە:

- خۆ پیشاندان کە هەڵدانی تەنیشت جێبەجێ دەکات بەڵام لە پڕ تۆپەکە بەجێ دەهێڵێت بۆ یاریزانی هاوڕێی لە تیپەکەی خۆی بۆ جێبەجێکردنی هەڵدانەکە.
- خۆ دواخستن لە بەجێهێشتنی یاریگا لە کاتی کاری ئاڵوگۆڕینی یاریزان.
- دواخستنی لە ئەندازە بەدەر بۆ دەستپێکردنەوەی یاری.
- تێهەڵدانی تۆپ یان هەڵگرتنی تۆپ بۆ شوێنێکی دوورتر لە شوێنی خۆی یان هانی بەرەنگاری بە کۆمەڵ بدات (ڕوودانی ئاژاوەی بە کۆمەڵ) بەوەی دەست لە تۆپ دەدات بە ئەنقەست پاش ئەوەی داوەر یاری دەوەستێنێت.
- جێبەجێکردنی لێدانی ئازاد (ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ) لە شوێنێکی هەڵەوە بە مەبەستی ناچارکردنی داوەر بە دووبارەکردنەوەی لێدانەکە.

### سەرپێچییەکانی دەرکردن (بە کارتی سوور) (Sending-off offences):

یاریزان یان یاریزانی یەدەك یان یاریزانی گۆڕاو هەر یەکێ لەم سەرپێچییانەی خوارەوە ئەنجام بدات ئەوا دەردەکرێت (بە کارتی سوور):

1. بێ بەشکردنی (نەهێشتنی) تیپی بەرامبەر لە تۆمارکردنی گۆڵ یان لە هەلێکی ئاشکرا بۆ تۆمارکردنی گۆڵ بە گرتنی تۆپ بە دەست (جگە لە گۆڵپارێز لە ناوچەی سزای خۆی).
2. نەهێشتنی هەلێکی ئاشکرا بۆ تۆمارکردنی گۆڵ دژی یاریزانی بەرامبەر کە بجوڵێت بەرەو گۆڵی بەرامبەر ئەوەش بە یەکێ لەو سەرپێچیانەی کە سزا دەدرێت بە لێدانی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ (جگە لەوەی کە پوختە کراوە لە خوارەوە وئاماژەی پێکراوە).
3. یاری مەترسیدار.
4. تف کردن لە یاریزانی بەرامبەر یان لە هەر کەسێکی تر.
5. ڕەفتاری توندوتیژ.
6. بەکارهێنانی ئاماژە یان ووشەی سووك یان قێزەون یان شەڕانی.
7. وەرگرتنی دووەم کارتی زەرد لە هەمان یاریدا.



ئەو یاریزانەی یان ئەو یاریزانە یەدەکەی یان ئەو یاریزانە گۆڕاوەی کە دەردەکرێت (بە کارتی سوور) دەبێت دەوروپشتی یاریگا وناوچەی هونەری بەجێ بهێڵێت.

### نەهێشتن لە تۆمارکردنی گۆڵ یان لە هەلێکی ئاشکرا بۆ تۆمارکردنی گۆڵ (Denying a goal or an obvious goal-scoring opportunity):

**کاتێ یاریزان هەڵدەستێت بەبێ بەشکردنی تیپی بەرامبەر لە تۆمارکردنی گۆڵ یان لە هەلێکی ئاشکرا بۆ تۆمارکردنی گۆڵ بە گرتنی تۆپ بە دەستی ئەنقەست ئەوا دەبێت ئەو یاریزانە دەربکرێت بە کارتی سوور لەهەر کوێیەکدا سەرپێچییەکە ڕوو بدات.**

**کاتێ یاریزانێك سەرپێچییەك ئەنجام دەدات دژی یاریزانی بەرامبەر لە ناوچەی سزای خۆی لە چوارچێوەی بەبێ بەشکردنی یاریزانی بەرامبەر لە هەلێکی ئاشکرا بۆ تۆمارکردنی گۆڵ و داوەر لێدانی سزای ئەژمار کرد، ئەوا یاریزانی سەرپێچیکار دەبێت ئاگادار بکرێتەوە (بە کارتی زەرد) جگە لەم حاڵەتانەی خوارەوە کە دەبێت دەربکرێت (بە کارتی سوور):**

- **سەرپێچییەکە گرتن یان پاڵنان یان ڕاکێشان بێت. یان**
- **یاریزانی سەرپێچیکار هەوڵی ئەوەی نەدا کە یاری بۆ تۆپ بکات یان یاریزان هیچ ئەگەرێکی (ئیحتیمالی) نەبوو بۆ بەرەنگاربوونەوە ویاریکردنی تۆپ. یان**

- **سەرپێچییەكە یەكێ بوو لەو سەرپێچییانەی كە شایستەی دەركردنە (بە كارتی سوور) لە هەر كوێیەكدا ڕوو بدات لە یاریگادا (بۆ نموونە: یاری مەترسیدار یان ڕەفتاری توندوتیژ ..وهتد).**

**لە هەموو ئەو سێ حاڵەتانەی سەرەوە كە باسكراوە دەركردنە بە كارتی سوور.**

دەبێت ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بكرێت:

- ماوەی (مسافە) نێوان سەرپێچیەكە وگۆڵەكە.
- ئاڕاستەی یاری بە شێوەیەكی گشتی.
- توانای پارێزگاری یان بە دەستهێنانی كۆنترۆڵ كردنی تۆپی هەبێت.
- شوێن وژمارەی یاریزانانی بەرگری.

## یاری مەترسیدار (Serious foul play):

هێرش كردن یان بەرەنگار بوونەوە كە سەلامەتی بەرامبەر تووشی مەترسی بكات یان هێزێكی زیاتر لە پێویست بەكار بهێنێت یان كارێكی دڕندانە ئەنجام بدات ئەوا دەبێت ئەو یاریزانە سزا بدرێت وەك یاری توندوتیژ.

هەر یاریزانێك هێرش بكاتە سەر یاریزانی بەرامبەر لە كاتی ڕكابەری بۆ تۆپ لە پێشەوە یان لە تەنیشتەوە یان لە دواوە بە قاچێكی یان هەردوو قاچی بە بەكارهێنانی هێزێكی زیاتر لە پێویست یان سەلامەتی یاریزانی بەرامبەر ڕوو بە ڕووی مەترسی بكاتەوە ئەوە تاوانبارە بە یاری مەترسیدار.

## ڕەفتاری توندوتیژ (Violent conduct):

ڕەفتاری توندوتیژ ئەوەیە كاتێ یاریزان هەڵدەستێت بە بەكارهێنان یان **هەوڵدان بۆ بەكارهێنانی** هێزێكی زیاتر لە پێویست یان كارێكی دڕندانە بەكاربهێنێت دژی بەرامبەر كاتێ بەرەنگاربوونەوە نەبێت بۆ تۆپ، یان دژی یاریزانی هاوڕێی خۆی یان كارگێڕی تیپ یان داوەرانی یاری یان هاندەران یان هەر كەسێكی تر **بێ گوێدان بەوەی بەركەوتن ڕوویدا بێت.**

**سەرەرای ئەوەش، ئەو یاریزانەی كە ڕكابەری تۆپ ناكات هەڵدەستێت بە لێدانی بەرامبەر یان هەر كەسێكی تر بە ئەنقەست بۆ سەری یان دەم وچاوی ئەوەش بە بەكارهێنانی دەست یان ئانیشك ئەوا تاوانبارە بە ڕەفتاری توندوتیژ مەگەر ئەو هێزەی كە بەكاری دەهێنێت هیچ بایەخێكی نەبووبێت.**

## سەرپێچییەكان بە فڕێدانی شتێك (یان تۆپ) (Offences where an object (or the ball) is thrown):

ئەگەر تۆپ لە یاریدا بوو ویاریزان یان یاریزانی یەدەك یان یاریزانی گۆڕاو هەستا بە فڕێدانی شتێك (ئەگەر تۆپیش بێت) بۆ یاریزانی بەرامبەر یان هەر كەسێكی تر ئەوا داوەر دەبێت یاری بوەستێنێت و ئەگەر سەرپێچییەكە:

- هەڵەشەیی بوو – ئەوا یاریزانی سەرپێچیكار ئاگادار دەكرێتەوە (بە كارتی زەرد) لەبەر ڕەفتاری ناوەرزشی.
- هێزێكی زیاتر لە پێویست بوو – ئەوا یاریزانی سەرپێچیكار دەردەكرێت (بە كارتی سوور) لەبەر ڕەفتاری توندوتیژ.

4. دەستپێکردنەوەی یاری پاش هەڵە وبەد ڕەفتاری (Restart of play after fouls and misconduct):

- ئەگەر تۆپ لە دەرەوەی یاری بوو، یاری دەستپێدەکاتەوە بە پێی بڕیاری پێشوو.
- ئەگەر تۆپ لە یاری بوو، ویاریزان لە نێو یاریگا سەرپێچی ئەنجامدا دژی:
  - یاریزانی بەرامبەر: لێدانی ناڕاستەوخۆ یان ڕاستەوخۆ یان لێدانی سزا.
  - یاریزانی هاوڕێی لە تیپەکەی خۆی یان یاریزانی یەدەك یان یاریزانی گۆڕاو یان کارگێری تیپ یان داوەرانی یاری: لێدانی ڕاستەوخۆ یان لێدانی سزا.
  - هەر کەسێکی تر: بەردانەوەی تۆپ.
- ئەگەر تۆپ لە یاری بوو ویاریزان سەرپێچی ئەنجامدا لە دەرەوەی یاریگا:
  - ئەگەر یاریزان پێشتر لە دەرەوەی یاریگا بوو ئەوا یاری دەستپێدەکاتەوە بە بەردانەوەی تۆپ.
  - ئەگەر یاریزان یاریگای بەجێ هێشت بۆ ئەنجامدانی سەرپێچیەك ئەوا یاری دەستپێدەکاتەوە بە لێدانی ناڕاستەوخۆ لە شوێنی تۆپ کاتێ یاری وەستێنرا. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەگەر یاریزان یاریگای بەجێ بهێڵێت وەك بەشێك لە یاری وسەرپێچی ئەنجامدا دژی یاریزانێکی تر ئەوا یاری دەستپێدەکاتەوە بە لێدانی ئازاد وجێبەجێ دەکرێت لە نزیکترین هێڵی سنووری یاریگا لەو شوێنەی کە سەرپێچییەکەی لێ ئەنجامدرا: بۆ ئەو سەرپێچییانەی کە شایستەی لێدانی ڕاستەوخۆن ئەوا لێدانی سزا ئەژمار دەکرێت ئەگەر هاتوو ئەم حاڵەتە ڕوویدا لە ناوچەی سزای یاریزانی سەرپێچیکار.
- ئەگەر یاریزانی وەستاو لە نێو یان دەرەوەی یاریگا هەستێت بە فڕێدانی شتێك بۆ یاریزانی بەرامبەر کە لە نێو یاریگادایە ئەوا یاری دەستپێدەکاتەوە بە لێدانی ڕاستەوخۆ یان لێدانی سزا لەو شوێنەی کە شتەکەی بەرکەوت یان خەریك بوو بەری بکەوێت.
- یاری دەستپێدەکاتەوە بە لێدانی ناڕاستەوخۆ ئەگەر:
  - یاریزانی وەستاو لە نێو یاریگا هەستێت بە فڕێدانی شتێك بۆ هەر کەسێك لە دەرەوەی یاریگا.
  - یاریزانی یەدەك یان یاریزانی گۆڕاو هەستێت بە فڕێدانی شتێك بۆ یاریزانی بەرامبەر کە وەستاوە لە نێو یاریگا.

## بەندی (13) لێدانی ئازاد (Free Kicks):

### 1. جۆرەکانی لێدانی ئازاد (Types of free kick):

لێدانی ڕاستەوخۆ وناڕاستەوخۆ دەدرێتە تیپی بەرامبەری ئەو یاریزانەی کە تاوانبارە بە ئەنجامدانی سەرپێچی یان هەڵە.

### هێمای لێدانی ناڕاستەوخۆ (Indirect free kick signal):

داوەر ئاماژە دەدات بە لێدانی ناڕاستەوخۆ بە بەرزکردنەوەی دەستی بە ڕێکی لە سەروی سەر، ئەم نیشانەیە دەهێڵێتەوە هەتا لێدانەکە لێ دەدرێت وتۆپ بەر یاریزانێکی تر دەکەوێت یان دەچێتە دەرەوەی یاری.

دەبێت لێدانی ناڕاستەوخۆ دووبارە بکرێتەوە ئەگەر داوەر نەیتوانی (یان بیری چوو) ئاماژە بدات کە لێدانەکە ناڕاستەوخۆیە وتۆپ یەکسەر لێدرا بۆ ناو گۆڵ.

### تۆپ چوونە ناو گۆڵەوە (Ball enters the goal):

- ئەگەر لێدانی ڕاستەوخۆ یەکسەر لێدرا بۆ ناو گۆڵی بەرامبەر ئەوا دەبێتە گۆڵ.
- ئەگەر لێدانی ناڕاستەوخۆ یەکسەر لێدرا بۆ ناو گۆڵی بەرامبەر ئەوا دەبێتە لێدانی گۆڵ (لێدانی ماڵی گۆڵ).
- ئەگەر لێدانی ڕاستەوخۆ یان لێدانی ناڕاستەوخۆ یەکسەر لێدرا بۆ ناو گۆڵی تیپی خۆیان ئەوا دەبێتە لێدانی گۆشە (لێدانی كۆرنە).

### 2. چۆنێتی جێبەجێکردن (Procedure):

هەموو لێدانەکانی ئازاد (لێدانە ڕاستەوخۆ وناڕاستەوخۆكان) جێبەجێ دەکرێت لەو شوێنەی کە سەرپێچییەکەی لێ ئەنجامدراوە، جگە لەمانەی خوارەوە:

- لێدانی ناڕاستەوخۆ بۆ تیپی هێرشبەر بۆ ئەو سەرپێچییەی کە لە ناو ناوچەی گۆڵی تیپی بەرامبەر ڕوو دەدات وجێبەجێ دەکرێت لە نزیکترین خاڵ لەسەر هێڵی ناوچەی گۆڵ تەریب بە هێڵی گۆڵ.
- لێدانی ئازاد (ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ) بۆ تیپی بەرگری لە ناوچەی گۆڵی خۆیان وجێبەجێ دەکرێت لە هەر شوێنێك لە ناوچەی گۆڵ.
- لێدانەکانی ئازاد (لێدانە ڕاستەوخۆ وناڕاستەوخۆكان) کە پەیوەستە بە چوونە ژوورەوەی یاریزان یان دووبارە هاتنە نێو یاریگا یان بەجێهێشتنی یاریگا بەبێ پرسی داوەر ولێدانەکە جێبەجێ دەکرێت لە شوێنی تۆپ کاتێ یاری لێ وەستێنرا. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەگەر یاریزان یاریگای بەجێهێشت وەك بەشێ لە جوڵەی یاری وهەستا بە ئەنجامدانی سەرپێچی دژی یاریزانێکی تر ئەوا یاری دەستپێدەكاتەوە بە لێدانی ئازاد لەسەر نزیکترین هێڵی سنووری یاریگا لەو شوێنەی سەرپێچییەکەی لێ ئەنجامدرا؛ بۆ سەرپێچی لێدانی ڕاستەوخۆ ئەوا لێدانی سزا ئەژمار دەکرێت ئەگەر هاتوو ئەمە ڕوویدا لە ناوچەی سزای سەرپێچیكار.
- یاسای تۆپی پێ ئاماژەی بە شوێنێکی تر کردبێت (سەیری بەندەکانی 3 و 11 و 12 بکە).

### تۆپ (The ball):

- تۆپ دەبێت جێگیر (وەستاو) بێت ویاریزانی لێدەری تۆپ نابێت جارێکی تر یاری بە تۆپ بکاتەوە هەتا بەر یاریزانێکی تر دەکەوێت.
- تۆپ دەچێتە یارییەوە کاتێ لێ دەدرێت وبە ئاشکرا دەجوڵێت جگە لێدانی ئازاد بۆ تیپی بەرگری لە ناوچەی سزای خۆیان تۆپ دەچێتە یارییەوە کاتێك تۆپ یەکسەر لێدرا بۆ دەرەوەی ناوچەی سزا.

هەتا تۆپ دەچێتە یارییەوە ئەوا دەبێت هەموو یاریزانانی تیپی بەرامبەر:

- بە لایەنی کەم ماوەی 9.15 م (10 یاردە) لە تۆپەکەوە دووربن، جگە لەوەی دەتوانن بمێننەوە لەسەر هێڵی گۆڵی خۆیان لە نێوان هەردوو ئەستوونی گۆڵ.
- لە دەرەوەی ناوچەی سزا بۆ لێدانی ڕاستەوخۆ وناڕاستەوخۆ لە ناو ناوچەی سزای تیپی بەرامبەر.

دەتوانرێت لێدانی ئازاد (ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ) جێبەجێ بکرێت بە بەرزکردنەوەی تۆپ بە یەك پێ یان بە هەردوو پێ ی لە هەمان کاتدا.

هەستان بە فێڵ کردن لە کاتی جێبەجێکردنی لێدانی ئازاد (ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ) بۆ سەر لێ شێواندنی یاریزانانی بەرامبەر ڕێگەی پێدراوە وەك بەشێك لە یاری تۆپی پێ.

ئەگەر یاریزان لێدانی ئازاد (ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ) بە شێوەیەکی ڕاست ودروست جێبەجێ بکات وبە ئەنقەست تۆپ بکێشێت بە یاریزانی بەرامبەر بۆ ئەوەی یاری بە تۆپ بکاتەوە جارێکی تر بەڵام بە مەرجێ بە شێوەیەکی کەمتەرخەم یان هەڵەشە یان هێزێکی زیاتر لە پێویست بەکار نەهێنێت، ئەوا داوەر ڕێگە دەدات بە بەردەوام بوونی یاری.

### 3. سەرپێچییەکان وسزادان (Infringements and sanctions):

کاتێ لێدانی ئازاد (ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ) جێبەجێ دەکرێت ئەگەر یاریزانانی تیپی بەرامبەر نزیك بوون لە تۆپ و لەو ماوە پێویستەی بۆیان دیاریکراوە ئەوا لێدانەکە دووبارە دەکرێتەوە، جگە لەوەی ئەگەر هاتوو توانرا یاسای سوود بەخش بەکاربهێنرێت: بەڵام ئەگەر یاریزان لێدانەکەی بە خێرایی جێبەجێکرد ویاریزانانی بەرامبەر وەستابوون کەمتر لە ماوەی 9.15 م (10 یاردە) لە تۆپەکەوە ئەوا داوەر ڕێگە دەدات بە بەردەوام بوونی یاری. لەگەڵ ئەوشدا، ئەو یاریزانە بەرامبەرەی کە بە ئەنقەست نایەڵێت لێدانەکە بە خێرایی جێبەجێ بکرێت دەبێت ئاگادار بکرێتەوە (بە کارتی زەرد) لەبەر دواخستنی دەستپێکردنەوەی یاری.

کاتێ لێدانی ئازاد (ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ) بە خێرایی جێبەجێ دەکرێت لەلایەن تیپی بەرگری لە ناوچەی سزای خۆیان وئەگەر هەر یاریزانێکی تیپی بەرامبەر هێشتا لە ناو ناوچەی سزا بێت چونکە ئەوان کاتیان لەبەردەم نەمابوو بۆ بەجێهێشتنی ناوچەی سزا، ئەوا داوەر ڕێگە دەدات بە بەردەوام بوونی یاری.

کاتێ لێدانی ئازاد (ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ) جێبەجێ دەکرێت لەلایەن تیپی بەرگری لە ناوچەی سزای خۆیان وتۆپ یەکسەر لێ نەدرا بۆ دەرەوەی ناوچەی سزا ئەوا لێدانەکە دووبارە دەکرێتەوە.

پاش ئەوەی تۆپ دەچێتە یارییەوە ئەگەر لێدەری تۆپ جارێکی تر بەر تۆپ بکەوێت پێش ئەوەی بەر یاریزانێکی تر بکەوێت ئەوا دەبێتە لێدانی ناڕاستەوخۆ، ئەگەر لێدەری تۆپ بە ئەنقەست تۆپی بەر دەست کەوت ئەوا:

- دەبێتە لێدانی ڕاستەوخۆ.
- دەبێتە لێدانی سزا ئەگەر سەرپێچییەکە ڕوویدا لە ناو ناوچەی سزای خۆیان، جگە لەوەی لێدەری تۆپەکە گۆڵپارێز بوو لەم حاڵەتە دەبێتە لێدانی ناڕاستەوخۆ.

## بەندی (14) لێدانی سزا (The Penalty Kick):

لێدانی سزا دەژمێردرێت ئەگەر یاریزان سەرپێچییەکی لێدانی ڕاستەوخۆ ئەنجام بدات لە ناوچەی سزای خۆیدا یان لە دەرەوەی یاریگا وەك بەشێك لە جوڵەی یاری هەروەك چۆن ڕوونکراوەتەوە لە بەندی 12 و13دا.

دەکرێت لە لێدانی سزادا یەکسەر گۆڵ تۆمار بکرێت.

### 1. چۆنێتی جێبەجێکردن (Procedure):

دەبێت تۆپ بە شێوەیەکی جێگیر (نەجوڵاو) لەسەر خاڵی سزا دابنرێت.

ئەو یاریزانەی کە لێدانی سزا ئەنجام دەدات دەبێت بە شێوەیەکی ئاشکرا دیاری بکرێت.

دەبێت گۆڵپارێزی تیپی بەرگری لە سەر هێڵی گۆڵ بمێنێتەوە و ڕوو لە یاریزانی لێدەری سزا بکات لە نێوان هەردوو ئەستوونی گۆڵ هەتا تۆپەکە لێدەدرێت.

جێگای یاریزانانی تر جگە لە لێدەری سزا و گۆڵپارێز بەم شێوەیە دەبێت:

- بە لایەنی کەمەوە ماوەی 9.15 م (10 یاردە) دوور بن لە خاڵی سزاوە.
- لە پشتی خاڵی سزاوە بن.
- لە چوار چێوەی یاریگادا بن.
- لە دەرەوەی ناوچەی سزا بن.

پاش ئەوەی یاریزانان لە شوێنی خۆیان دەوەستن بەپێی یاسا ئەوا داوەر ئاماژە دەدات بە جێبەجێکردنی لێدانی سزاکە.

ئەو یاریزانەی کە لێدانی سزا ئەنجام دەدات دەبێت تۆپ لێبدات بۆ پێشەوە؛ لێدانی سزا بە پاژنەی پێ ی ڕێگە پێدراوە بە مەرجێ تۆپ بۆ پێشەوە بجوڵێت.

تۆپ دەچێتە یارییەوە کاتێ تۆپ لێ دەدرێت ودەجوڵێت بە ڕوونی.

ڕێگە نادرێت بەو یاریزانەی کە لێدانی سزا ئەنجام دەدات کە جارێکی تر یاری بە تۆپ بکاتەوە هەتا بەر یاریزانێکی تر دەکەوێت.

لێدانی سزا تەواو دەبێت کاتێ تۆپ دەوەستێت لە جوڵە یان تۆپ دەڕواتە دەرەوەی یاری یان داوەری یاری دەوەستێنێت بۆ هەر سەرپێچییەك لە یاسای یاری.

کاتی زیادە ڕێ پێدەدرێت (کات درێژدەکرێتەوە) بۆ جێبەجێکردنی لێدانی سزا وتەواو دەکرێت لە کۆتایی هەر تایمێکی یاری یان تایمەکانی کاتی زیادکراو.

2. سەرپێچییەکان وسزادان (Infringements and sanctions):

هەر کاتێ داوەر ئاماژەی دا بۆ ئەنجامدانی لێدانی سزا ئەوا دەبێت لێدانەکە جێبەجێ بکرێت. پێش ئەوەی تۆپ بچێتە یارییەوە ئەگەر یەکێ لەمانەی خوارەوە ڕوویدا:

ئەو یاریزانەی لێدانی سزا ئەنجام دەدات یان یاریزانی هاورێی لە تیپەکەی خۆی سەرپێچی لە یاسای تۆپی پێ ی ئەنجامدا:

ئەگەر تۆپەکە بچێتە ناو گۆڵەوە ئەوا لێدانەکە دووبارە دەکرێتەوە.

ئەگەر تۆپەکە نەچێتە ناو گۆڵەوە ئەوا داوەر یاری دەوەستێنێت و یاری دەستپێدەکاتەوە بە لێدانی ناڕاستەوخۆ.

جگە لەم حاڵەتانەی خوارەوە کاتێ یاری دەوەستێنرێت ویاری دەستپێدەکاتەوە بە لێدانی ناڕاستەوخۆ بێگۆێدان بەوەی ئەگەر بێتو گۆڵ تۆمارکرا یان تۆمار نەکرا:

- لێدانی سزا بۆ دواوە لێ بدرێت.
- یاریزانی هاورێی یاریزانی دیاریکراوی لێدەری سزا هەستا بە جێبەجێکردنی لێدانی سزا؛ ئەوا داوەر ئەو یاریزانە ئاگادار دەکاتەوە ( بە کارتی زەرد) کە لێدانەکەی ئەنجامدا.
- هەستان بە فێڵ کردن کاتێ یاریزانی لێدەری سزا تەواو دەبێت لە ڕاکردن بۆ جێبەجێکردنی لێدانی سزا ئەوا داوەر یاریزانی لێدەری سزا ئاگادار دەکاتەوە (بە کارتی زەرد) (فێڵ کردن لە کاتی ڕاکردن بۆ جێبەجێکردنی لێدانی سزا ڕێگەی پێدراوە).

ئەگەر گۆڵپارێز یان یاریزانی هاورێی لە تیپەکەی خۆی هەستا بە سەرپێچی کردن لە یاسای یاری، ئەوا:

- ئەگەر تۆپ بچێتە گۆڵەوە، ئەوا گۆڵ دەژمێردرێت.
- ئەگەر تۆپ نەچێتە گۆڵەوە، ئەوا لێدانەکە دووبارە دەکرێتەوە؛ و گۆڵپارێز ئاگادار دەکرێتەوە (بە کارتی زەرد) ئەگەر ئەو بەرپرس بوو لە سەرپێچییەکە.

ئەگەر یاریزان لە هەردوو تیپ سەرپێچییان لە یاسای یارییەکە کرد، ئەوا لێدانەکە دووبارە دەکرێتەوە مەگەر یاریزان سەرپێچییەکی زۆر قورستر ئەنجام بدات (وەکو فێڵ کردنی نایاسایی).

پاش جێبەجێکردنی لێدانی سزا ئەگەر:

یاریزانی لێدەری سزا جارێکی تر یاری بە تۆپ بکات پێش ئەوەی بەر یاریزانێکی تر بکەوێت، ئەوا:

- لێدانی ناڕاستەوخۆ ئەژمار دەکرێت (یان لێدانی ڕاستەوخۆ ئەژمار دەکرێت بۆ دەست لێدان لە تۆپ بە ئەنقەست).

تۆپ بەر هۆکارێکی دەرەکی بکەوێت کاتێ دەجوڵێت بۆ پێشەوە، ئەوا:

- لێدانەکە دووبارە دەکرێتەوە.

تۆپ دەگەڕایەوە نێو یاریگا پاش ئەوەی بەر گۆڵپارێز یان ڕاجەکە یان ئەستوونی گۆڵ دەکەوێت ودواتر بەر هۆکارێکی دەرەکی دەکەوێت، ئەوا:

- داوەر یاری دەوەستێنێت.
- یاری دەستپێدەکاتەوە بە بەردانەوەی تۆپ لەو شوێنەی کە تۆپەکە بەر هۆکارە دەرەکیەکە کەوت.

3. پوختەی خشتەی سەرپێچی لێدانی سزا (Summary table):

| | دەرەنجامی لێدانی سزا | |
|---|---|---|
| | ئەگەر گۆڵ بوو | ئەگەر گۆڵ نەبوو |
| سەرپێچی لەلایەن یاریزانی هێرشبەر | دووبارە کردنەوەی لێدانی سزا | لێدانی ناڕاستەوخۆ |
| سەرپێچی لەلایەن یاریزانی بەرگری | گۆڵە | دووبارە کردنەوەی لێدانی سزا |
| سەرپێچی لەلایەن گۆڵپارێز | گۆڵە | دووبارە کردنەوەی لێدانی سزا وئاگادارکردنەوەی گۆڵپارێز (بە کارتی زەرد) |
| لێدانی تۆپ بۆ دواوە | لێدانی ناڕاستەوخۆ | لێدانی ناڕاستەوخۆ |
| فێڵ کردنی نایاسایی | لێدانی ناڕاستەوخۆ وئاگادارکردنەوەی لێدەری سزا (بە کارتی زەرد) | لێدانی ناڕاستەوخۆ وئاگادارکردنەوەی لێدەری سزا (بە کارتی زەرد) |
| یاریزانی لێدەری هەڵە (ئەو یاریزانەیە کە دیاری نەکراوە بۆ لێدانی سزا، واتە یاریزانێکی تر جگە لە یاریزانی لێدەری دیاریکراو) | لێدانی ناڕاستەوخۆ وئاگادارکردنەوەی لێدەری هەڵە (بە کارتی زەرد) | لێدانی ناڕاستەوخۆ وئاگادارکردنەوەی لێدەری هەڵە (بە کارتی زەرد) |



**بەندی (15) هەڵدانی تەنیشت (The Throw-in):**

**هەڵدانی تەنیشت دەدرێت بە تیپی بەرامبەری ئەو یاریزانەی کە دوایین کەس بوو بەر تۆپ کەوت کاتێ تۆپ بە هەموو قەبارەیەوە لەسەر هێڵی گۆڵ ولەسەر زەوی یان لە هەوادا تێپەڕ دەبێت.**

**لە هەڵدانی تەنیشت یەکسەر گۆڵ تۆمار ناکرێت:**

- **ئەگەر تۆپ یەکسەر بچێتە ناو گۆڵی تیپی بەرامبەر، ئەوا دەبێتە لێدانی گۆڵ (لێدانی ماڵی گۆڵ).**
- **ئەگەر تۆپ یەکسەر بچێتە ناو گۆڵی یاریزانی هەڵدەری تەنیشت، ئەوا دەبێتە لێدانی گۆشە (لێدانی کۆرنە).**

**1. چۆنێتی جێبەجێکردن (Procedure):**

**لە ساتی هەڵدانی تۆپ، دەبێت هەڵدەری تۆپ:**

- **ڕوو لە یاریگا بکات.**
- **بەشێك لە هەردوو پێ ی لەسەر هێڵی تەنیشت بێت یان لەسەر زەوی لە دەرەوەی هێڵی تەنیشت بێت.**
- **تۆپ هەڵبدات بە هەردوو دەستی لە پشتی سەری ولە سەرووی سەری لە خاڵی چوونە دەرەوەی تۆپ لە یاریگا.**

**دەبێت هەموو یاریزانانی تیپی بەرامبەر بە لایەنی کەمەوە ماوەی 2 م (2 یاردە) دوور بوەستن لە خاڵی جێبەجێکردنی هەڵدانی تەنیشت.**

**هەر تۆپەکە چووە نێو یاریگا ئەوا تۆپ دەچێتە یارییەوە. ئەگەر تۆپ بەر زەوی کەوت پێش ئەوەی بچێتە نێو یاریگاوە ئەوا هەڵدانی تەنیشت دووبارە دەکرێتەوە لەلایەن هەمان تیپ ولە هەمان شوێنی خۆی. ئەگەر هەڵدانی تەنیشت بە شێوەیەکی ڕاست ودروست جێبەجێ نەکرا ئەوا هەڵدانی تەنیشت جێبەجێ دەکرێت لەلایەن تیپی بەرامبەرەوە.**

**کاتێ هەڵدانی تەنیشت بە شێوەیەکی ڕاست ودروست جێبەجێ دەکرێت و ئەگەر یاریزان بە شێوەیەکی ئەنقەست تۆپەکەی فڕێدا بۆ جەستەی یاریزانی بەرامبەر بۆ ئەوەی یاری بە تۆپ بکاتەوە جارێکی تر بەڵام بە شێوەیەکی هەڵەشەیی یان کەمتەرخەم یان هێزێکی زیاتر لە پێویست نەبوو ئەوا داوەر ڕێگە دەدات بە بەردەوام بوونی یاری.**

**دەبێت یاریزانی هەڵدەری تەنیشت جارێکی تر بەر تۆپ نەکەوێت هەتا بەر یاریزانێکی تر دەکەوێت.**

**2. سەرپێچییەکان وسزادان (Infringements and sanctions):**

**پاش ئەوەی تۆپ دەچێتە یارییەوە ئەگەر یاریزانی هەڵدەری تەنیشت بەر تۆپ کەوت پێش ئەوەی بەر یاریزانێکی تر بکەوێت ئەوا دەبێتە لێدانی ناڕاستەوخۆ: ئەگەر یاریزانی هەڵدەری تەنیشت دەستی بەر تۆپ کەوت بە ئەنقەست، ئەوا:**

- **لێدانی ڕاستەوخۆ دەژمێردرێت.**
- **لێدانی سزا دەژمێردرێت ئەگەر سەرپێچییەکە لە ناوچەی سزای یاریزانی هەڵدەری تەنیشت ڕوویدا جگە لەوەی ئەگەر گۆڵپارێزی تیپی بەرگری تۆپی بەر دەست کەوت بە ئەنقەست، لەم حاڵەتەدا دەبێتە لێدانی ناڕاستەوخۆ.**

**ئەگەر یاریزانی بەرامبەر هەستا بە تەگەرەخستن یان ڕێ گرتن لەو یاریزانەی هەڵدانی تەنیشت جێبەجێ دەکات بە شێوەیەکی نایاسایی (هەروەك جوڵاندن بۆ نزیکتر لە ماوەی 2 م (2 یاردە) لە شوێنی جێبەجێکردنی هەڵدانی تەنیشت) ئەوا دەبێت ئاگادار بکرێتەوە (بە کارتی زەرد) لەبەر ڕەفتاری ناوەرزشی وئەگەر هەڵدانی تەنیشت جێبەجێ کرابوو ئەوا دەبێتە لێدانی ناڕاستەوخۆ.**

**بۆ هەر سەرپێچییەکی تر لەم بەندە ئەوا هەڵدانی تەنیشت جێبەجێ دەکرێت لەلایەن تیپی بەرامبەرەوە.**

## بەندی (16) لێدانی گۆڵ (ماڵی گۆڵ) (The Goal Kick):

لێدانی گۆڵ (ماڵی گۆڵ) دەژمێردرێت کاتێ تۆپ بە هەموو قەبارەیەوە لەسەر هێڵی گۆڵ ولەسەر زەوی یان لە هەوادا تێپەڕ دەبێت ویاریزانی تیپی هێرشبەر دوایین کەس بوو کە بەر تۆپ کەوت، وگۆڵ تۆمار نەکرا.

بە لێدانی گۆڵ (ماڵی گۆڵ) یەکسەر گۆڵ تۆمار دەکرێت بەڵام تەنها لە گۆڵی تیپی بەرامبەر: ئەگەر تۆپ چووە ناو گۆڵی تیپی لێدەری گۆڵ پاش ئەوەی تۆپ ناوچەی سزا دەبڕێ ئەوا لێدانی گۆشە (کۆرنە) دەدرێتە تیپی بەرامبەر.

### 1. چۆنێتی جێبەجێکردن (Procedure):

- دەبێت تۆپ جێگیر (نەجولاو) بێت و لێ بدرێت لە هەر شوێنێك بێت لە چوارچێوەی ناوچەی گۆڵ (ماڵی گۆڵ) لەلایەن یاریزانی تیپی بەرگری.
- تۆپ دەچێتە یارییەوە بە لێدانی تۆپ بۆ دەرەوەی ناوچەی سزا.
- دەبێت یاریزانانی تیپی بەرامبەر لە دەرەوەی ناوچەی سزا بوەستن هەتا تۆپ دەچێتە یارییەوە.

### 2. سەرپێچییەکان وسزادان (Infringements and sanctions):

ئەگەر تۆپ ناوچەی سزا نەبڕی یان تۆپ بەر یاریزانێك بکەوێت پێش ئەوەی تۆپ ناوچەی سزا ببڕێت ئەوا لێدانی گۆڵ دووبارە جێبەجێ دەکرێتەوە.

پاش ئەوەی تۆپ دەچێتە یارییەوە، ئەگەر لێدەری ماڵی گۆڵ جارێکی تر بەر تۆپ کەوت پێش ئەوەی بەر یاریزانێکی تر بکەوێت ئەوا دەبێتە لێدانی ناڕاستەوخۆ: ئەگەر لێدەری ماڵی گۆڵ دەستی بەر تۆپ کەوت بە ئەنقەست، ئەوا:

- لێدانی ڕاستەوخۆ دەژمێردرێت.
- لێدانی سزا دەژمێردرێت ئەگەر سەرپێچییەکە لە ناوچەی سزای یاریزانی لێدەری گۆڵ ڕوویدا جگە لەوەی ئەگەر لێدەری ماڵی گۆڵ گۆڵپارێز بوو لەم حاڵەتەدا دەبێتە لێدانی ناڕاستەوخۆ.

ئەگەر یاریزانی بەرامبەر وەستا بێت لە ناوچەی سزا لە کاتی جێبەجێکردنی لێدانی ماڵی گۆڵ وبەر تۆپ کەوت یان ڕکابەری بۆ تۆپ کرد پێش ئەوەی تۆپ بەر یاریزانێکی تر بکەوێت ئەوا لێدانی گۆڵ دووبارە جێبەجێ دەکرێتەوە.

ئەگەر یاریزان چووە نێو ناوچەی سزا پێش ئەوەی تۆپ بچێتە یارییەوە وهەستا بە ئەنجامدانی سەرپێچی یان سەرپێچی لە دژی ئەنجامدرا لەلایەن یاریزانی بەرامبەری ئەوا لێدانی گۆڵ دووبارە جێبەجێ دەکرێتەوە ولەوانەیە یاریزانی سەرپێچیکار ئاگادار بکرێتەوە (بە کارتی زەرد) یان دەربکرێت (بە کارتی سوور) وبەپێی سروشتی سەرپێچییەکە.

بۆ هەر سەرپێچییەکی تر لەم بەندە ئەوا لێدانی گۆڵ دووبارە جێبەجێ دەکرێتەوە.

## بەندی (17) لێدانی کۆڕنە (گۆشە) (The Corner Kick):

لێدانی گۆشە (کۆرنە) دەژمێردرێت کاتێ تۆپ بە هەموو قەبارەیەوە لەسەر هێڵی گۆڵ ولەسەر زەوی یان لە هەوادا تێپەڕ دەبێت ویاریزانی تیپی بەرگری دوایین کەس بوو کە بەر تۆپ کەوت، وگۆڵ تۆمار نەکرا.

بە لێدانی گۆشە (کۆرنە) یەکسەر گۆڵ تۆمار دەکرێت بەڵام تەنها لە گۆڵی تیپی بەرامبەر: ئەگەر تۆپ چووە ناو گۆڵی تیپی لێدەری گۆشە ئەوا لێدانی گۆشە (کۆرنە) دەدرێتە تیپی بەرامبەر.

### 1. چۆنێتی جێبەجێکردن (Procedure):

- دەبێت تۆپەکە لە ناو ناوچەی گۆشە دابنرێت لە نزیکترین خاڵی چوونە دەرەوەی تۆپ لە هێڵی گۆڵ.
- دەبێت تۆپ جێگیر (نەجوڵاو) بێت و لێ بدرێت لەلایەن یاریزانی تیپی هێرشبەر.
- تۆپ دەچێتە یارییەوە کاتێ تۆپ لێ دەدرێت وبجولێت بە ڕوونی: پێویست ناکات تۆپ ناوچەی گۆشە ببڕێت.
- نابێت وەستاوی ئاڵای گۆشە بجولێنرێت.
- دەبێت یاریزانانی تیپی بەرامبەر بە لایەنی کەمەوە ماوەی 9.15 م (10 یاردە) لە کەوانەی گۆشە دووربن هەتا تۆپ دەچێتە یارییەوە.

### 2. سەرپێچییەکان وسزادان (Infringements and sanctions):

پاش ئەوەی تۆپ دەچێتە یارییەوە، ئەگەر لێدەری گۆشە جارێکی تر بەر تۆپ کەوت پێش ئەوەی بەر یاریزانێکی تر بکەوێت ئەوا دەبێتە لێدانی ناڕاستەوخۆ: ئەگەر لێدەری گۆشە دەستی بەر تۆپ کەوت بە ئەنقەست، ئەوا:

- لێدانی ڕاستەوخۆ دەژمێردرێت.
- لێدانی سزا دەژمێردرێت ئەگەر سەرپێچییەکە لە ناوچەی سزای یاریزانی لێدەری گۆشە ڕوویدا جگە لەوەی ئەگەر لێدەری گۆشە گۆڵپارێز بوو لەم حاڵەتەدا دەبێتە لێدانی ناڕاستەوخۆ.

کاتێ لێدانی گۆشە بە شێوەیەکی ڕاست ودروست جێبەجێکرا و ئەگەر یاریزان بە شێوەیەکی ئەنقەست تۆپەکەی لێدا بە جەستەی یاریزانی بەرامبەر بۆ ئەوەی یاری بە تۆپ بکاتەوە جارێکی تر بەڵام بە شێوەیەکی هەڵەشەیی یان کەمتەرخەم یان هێزێکی زیاتر لە پێویست نەبوو ئەوا داوەر ڕێگە دەدات بە بەردەوام بوونی یاری.

بۆ هەر سەرپێچییەکی تر لەم بەندە ئەوا لێدانی گۆشە دووبارە جێبەجێ دەکرێتەوە.

ئەم وێنەیە کە پیشان دراوە ئاماژە بە هەندێ شوێنی دانانی ڕاست وهەڵەی تۆپ دەکات



## ڕێنمایی کرداری بۆ داوەرانی یاری (Practical Guidelines for Match Official):

### پێشەکی (Introduction):

ئەم ڕێنماییانە پێك دێت لە ئامۆژگاری کرداری بۆ داوەرانی یاری کە تەواوکەری ئەو زانیارییانەیە کە لە برگەی بەندەکانی یاسای تۆپی پێ ی دا هاتووە.

ئاماژە بە کاری داوەران دراوە لە بەندی 5 دا لە چوارچێوەی یاسای یاری و"ڕوحی یاری". ئەوە چاوەڕوان دەکرێت لە داوەران کە هەستن بە بەکارهێنانی کاری گونجاو و جێبەجێکردنی "ڕوحی یاری" کاتێ یاسای یاری جێبەجێ دەکرێت، بە تایبەتی لە کاتی بڕیاردان کە پەیوەندی هەیە بە ئەنجامدانی یاری و/یان بەردەوام بوونی یاری.

ئەمە بە شێوەیەکی تایبەتی ڕاستە بۆ ئاستە نزمەکان لە یاری تۆپی پێ کە هەمیشە ناکرێت یاسای یاری بەوردی جێبەجێ بکرێت. بۆ نموونە: جگە لە کێشەی سەلامەتی ئەوا دەبێت داوەر ڕێگە بدات بە دەستپێکردنی/بەردەوام بوونی یاری لەم حاڵەتانەی خوارەوە:

- نەبوونی یەکێ یان زیاتر لە وەستاوەکانی ئاڵای گۆشە.
- ناوردێکی بچووك هەیە لە هێڵکاری لەسەر یاریگادا، بۆ نموونە: ناوچەی گۆشە، بازنەی ناوەڕاست .....هتد.
- ڕەنگی ئەستوونی گۆڵەکان یان ڕاجەکە سپی نەبوو.

لە حاڵەتی ئەوها، دەبێت داوەر، بە ڕەزامەندی هەردوو تیپ، درێژە بدات بە یاری ودەبێت ڕاپۆرت بەرز بکاتەوە بۆ لایەنی پەیوەندیدار.

کلیل:

AR = یاریدەدەری داوەر

AAR = یاریدەدەری داوەری زیادە

## شوێن و جوڵە و کارکردن بە گۆمەڵ (Positioning, Movement and Teamwork)

### 1. شوێن و جوڵە بە شێوەیەکی گشتی (General positioning and movement):

**باشترین شوێن ئەو شوێنەیە کە داوەر دەتوانێت بڕیاری ڕاست ودروستی تێدا بدات. دەبێت هەموو ئەو ڕاسپاردانەی (پێشنیارکراوانەی) دەربارەی هەڵبژاردنی شوێن ڕاست بکرێتەوە بە بەکارهێنانی زانیاری دیاریکراو دەربارەی تیپەکان و یاریزانان و ڕووداوەکان لە کاتی یاریدا.**

**ئەو شوێنانەی پێشنیارکراوە لە وێنەکاندا ڕێنمایی بنەڕەتین. مەبەست لە ئاماژەدان بە "ناوچە" دڵنیا بوونە لەوەی کە شوێنی پێشنیارکراو لەو ناوچەیە کە داوەر ڕەنگە (لەوانەیە) بڕیاری زۆر ڕاست وکاریگەر بدات. ئەو ناوچەیە لەوانەیە گەورەتربێت یان بچووکتربێت یان بە شێوەیەکی جیاواز بێت پشت بەستن بە بارودۆخی تایبەتی یارییەکە.**

### ڕاسپاردەکان (پێشنیارەکان) (Recommendations):

- **پێویستە یاری لە نێوان داوەر ویاریدەدەری داوەری مەبەست بێت.**
- **یاریدەدەری داوەری مەبەست دەبێت لە چوار چێوەی بینینی داوەر بێت بە شێوەیەك دەبێت داوەر سیستەمی تیرەی پانی بەکاربهێنێت.**
- **مانەوەی لە دەرەوەی شوێنی یاری وادەکات کە یاری زۆر بە ئاسانی و ڕێك وپێکی بەردەوام بێت و وادەکات یاریدەدەری داوەری مەبەست لە چوار چێوەی بینینی داوەر بێت.**
- **دەبێت داوەر نزیك بێت ئەوەندەی پێویست بکات بۆ بینینی یاری بەبێ ئەوەی دەستێوەردان لە یاری بکات.**
- **"چی پێویستە کە ڕەچاو بکرێت وببینرێت" نابێت هەمیشە داوەر لە دەورووبەری تۆپ بێت.**

**هەروەها داوەر دەبێت بە ئاگا بێت لە:**

**بەرەنگاربوونەوە لە نێوان یاریزانان بەبێ تۆپ.**

**ئەو سەرپێچیانەی کە ڕەنگە (لەوانەیە) ڕوو بدات لەو ناوچەیەی کە یاری بۆ دەچێت.**

**ڕوودانی سەرپێچی پاش ئەوەی تۆپ یاری پێدەکرێ بۆ شوێنێکی دوور.**

**شوێنی یاریدەدەرانی داوەر و یاریدەدەرانی داوەری زیادە (Positioning of assistant referees and additional assistant referees):**

یاریدەدەری داوەر دەبێت لەگەڵ دووەم-دوایین یاریزانی بەرگری یان تۆپ بێت ئەگەر هاتوو تۆپەکە نزیکتربوو لە هێڵی گۆڵ لە دووەم-دوایین یاریزانی بەرگری.

یاریدەدەری داوەر دەبێت هەمیشە ڕووی لە یاریگا بکات تەنانەت لە کاتی ڕاکردنیشدا. دەبێت جوڵەی لا بۆ لا بەکاربهێنرێت ئەوەش بۆ ماوە کورتەکان. ئەمە گرنگە بە تایبەتی کاتێ چاودێری وبڕیاری ئۆفسايد دەدات هەروەك ئەمە باشترین هێڵی بینین دەداتە داوەر.

شوێنی یاریدەدەری داوەری زیادە لە پشتی گۆڵەوە دەبێت جگە لەو کاتەی کە پێویستە بجوڵێت لەسەر هێڵی گۆڵ بۆ چاودێری وبڕیاردان ئەگەر گۆڵ بوو یان گۆڵ نەبوو. ڕێگە نادرێت بە یاریدەدەری داوەری زیادە کە بێتە نێو یاریگاوە مەگەر تەنها لە هەندێ حاڵەتی جیاوازدا.

## 2. شوێن و کاری بە کۆمەڵ (Positioning and teamwork):

### ڕاوێژکردن (Consultation):

کاتێ مامەڵە لەگەڵ گرفتی سەرزەنشتی دەکرێت ئەوا پەیوەندیی چاو ونیشانەیەکی بنچینەیی بە ئاگا کردنەوەی شاراوە بە دەست لە لایەن یاریدەدەری داوەر بۆ داوەر لەوانەیە بەس بێت.

کاتێ ڕاوێژکردنی ڕاستەوخۆ پێویست بوو ئەوا یاریدەدەری داوەر دێتە نێو یاریگا ماوەی 2 بۆ 3 مەتر ئەگەر پێویست بکات. کاتی قسەکردن ئەوا دەبێت داوەر و یاریدەدەری داوەر هەردووك ڕوو بکەنە نێو یاریگا لەبەر ئەوەی خۆ بەدوور بگرن لە بیستنی لەلایەن ئەوانی ترەوە وچاودێری یاریزانان ویاریگا بکەن.



### لێدانی کۆڕنە (Corner kick):

شوێنی یاریدەدەری داوەر لە کاتی لێدانی گۆشە دەکەوێتە پشتی ئاڵای گۆشەوە لە یەك ئاستا بێت لە گەڵ هێڵی گۆڵ بەڵام نابێت دەستێوەردان لەگەڵ ئەو یاریزانە بکات کە لێدانی گۆشە جێبەجێ دەکات ودەبێت چاودێری ئەوە بێت کە تۆپەکە بە شێوەیەکی ڕاست دانراوە لە ناوچەی گۆشە.



### لێدانی ئازاد (ڕاستەوخۆ وناڕاستەوخۆ) (Free kick):

دەبێت شوێنی یاریدەدەری داوەر لە كاتی لێدانی ئازاد لە یەك ئاستا بێت لەگەڵ دووەم-دوایین یاریزانی بەرگری بۆ چاودێری كردنی هێڵی ئۆفسايد. لەگەڵ ئەوەشدا، یاریدەدەری داوەر دەبێت ئامادە بێت بۆ بەدواچوونی تۆپ بە جوڵانەوە لەسەر هێڵی تەنیشت بەرەو ئاڵای گۆشە ئەگەر هاتوو شووتێكی ڕاستەوخۆ لێدرا بەرەو گۆڵ.



ئەو حاڵەتانەی " گۆڵە / گۆڵ نیە (Goal/no goal)؛

کاتێ گۆڵ تۆمار دەکرێت وهیچ گۆمانێك نیە دەربارەی بڕیاری گۆڵەکە ئەوا داوەر ویاریدەدەری داوەر دەبێت پەیوەندیی چاو لە نێوانیان هەبێت ویاریدەدەری داوەر دەبێت پاشان بجوڵێت بە خێرایی ماوەی 25 بۆ 30 مەتر بە درێژایی هێڵی تەنیشت بەرەو هێڵی ناوەڕاست بەبێ بەرزکردنەوەی ئاڵا.

کاتێ گۆڵ تۆمار دەکرێت بەڵام وا دەر دەکەوێت کە تۆپەکە هێشتا لە یاریدایە، ئەوا دەبێت یاریدەدەری داوەر یەکەم کار هەستێت بە بەرزکردنەوەی ئاڵاکەی بۆ ڕاکێشانی سەرنجی داوەر دواتر بەردەوام بێت لە کاری گۆڵێکی ئاسایی ئەوەش بە ڕاکردنی خێرا ماوەی 25 بۆ 30 مەتر بە درێژایی هێڵی تەنیشت بەرەو هێڵی ناوەڕاست

لەو حاڵەتانەی کە تۆپ بە تەواوەتی وبە قەبارەی خۆی هێڵی گۆڵ نابڕێت ئەوا یاری بەردەوام دەبێت بە شێوەیەکی ئاسایی چونکە گۆڵ تۆمار نەکراوە، دەبێت داوەر هەستێت بە پەیوەندیی چاو لەگەڵ یاریدەدەری داوەر وئەگەر پێویست بکات ئەوا ئاماژەیەکی دەستی نهێنی بدات.



### لێدانی گۆڵ (ماڵی گۆڵ) (Goal kick):

یاریدەدەری داوەر دەبێت یەکەم کار هەستێت بە دڵنیا بوون لەوەی کە تۆپ لە نێو ناوچەی گۆڵ دانراوە. ئەگەر تۆپ بە شێوەیەکی ڕاست دانەنرا بوو ئەوا دەبێت یاریدەدەری داوەر نەجوڵێت لە شوێنی خۆی وهەستێت بە پەیوەندیی چاو لەگەڵ داوەر وبەرزکردنەوەی ئاڵاکەی. هەر کات تۆپ بە شێوەیەکی ڕاست دانرا لە نێو ناوچەی گۆڵ ئەوا یاریدەدەری داوەر دەبێت بجوڵێت بۆ لێواری ناوچەی سزا بۆ دڵنیا بوون لەوەی کە تۆپ ناوچەی سزای بەجێهێشتووە (تۆپ لە یارییە) ویاریزانانی هێرشبەر لە دەرەوەی ناوچەی سزان. لە کۆتاییدا یاریدەدەری داوەر دەبێت شوێنێك هەڵبژێرێت کە بتوانێت چاودێری هێڵی ئۆفساید بکات.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر یاریدەدەری داوەری زیادە ئامادەبوو، ئەوا یاریدەدەری داوەر دەبێت شوێنێك هەڵبژێرێت لە یەك ئاستا بێت لەگەڵ لێواری ناوچەی سزا ودواتر لەیەك ئاستا بێت لەگەڵ هێڵی ئۆفساید و دەبێت شوێنی یاریدەدەری داوەری زیادە لە خاڵی بەیەکگەیشتنی هێڵی گۆڵ وناوچەی گۆڵ بێت وچاودێری ئەوە بکات کە تۆپ بە شێوەیەکی ڕاست دانراوە لە نێو ناوچەی گۆڵ. ئەگەر تۆپ بە شێوەیەکی ڕاست دانەنرا بوو ئەوا دەبێت یاریدەدەری داوەری زیادە ئەمە بگەیەنێت بە داوەر.



فرێدانی تۆپ لەلایەن گۆڵپارێز (Goalkeeper releasing the ball):

**دەبێت یاریدەدەری داوەر لە یەك ئاستا بێت لەگەڵ لێواری ناوچەی سزا ودڵنیا بێت لەوەی گۆڵپارێز دەستی بەر تۆپ نەکەوتوو لە دەرەوەی ناوچەی سزا. هەر کات گۆڵپارێز هەستا بە فرێدانی تۆپ ئەوا یاریدەدەری داوەر دەبێت شوێنێك بۆ خۆی هەڵبژێرێت بۆ چاودێریکردنی هێڵی ئۆفساید.**



## لێدانی سەرەتا (Kick-off):

دەبێت یاریدەدەری داوەر لە یەك ئاستا بێت لەگەڵ دووەم-دوایین یاریزانی بەرگری.



**لێدان لە خاڵی سزاوە (لێدانی یەکلاکەرەوە) (Kicks from the penalty mark):**

دەبێت شوێنی یەکێ لە یاریدەدەرانی داوەر لە خاڵی بەیەکگەیشتنی هێڵی گۆڵ وناوچەی گۆڵ بێت. یاریدەدەرەکەی تری داوەر دەبێت لە بازنەی ناوەڕاست بێت بۆ کۆنترۆڵ کردنی یاریزانان. ئەگەر یاریدەدەرانی داوەری زیادە ئامادەبوون ئەوا دەبێت هەردووکیان بوەستن لە سەر خاڵی بە یەکگەیشتنی هێڵی گۆڵ و ناوچەی گۆڵ لەلای ڕاست وچەپی گۆڵ: وهەردوو یاریدەدەرانی داوەر دەبێت لە بازنەی ناوەڕاست بوەستن.



لێدانی سزا (Penalty kick):

**دەبێت شوێنی یاریدەدەری داوەر لە خاڵی بەیەکگەیشتنی هێڵی گۆڵ وناوچەی سزا بێت.**




**کاتێ یاریدەدەرانی داوەری زیادە ئامادەبوون ئەوا دەبێت شوێنی یاریدەدەری داوەری زیادە لە خاڵی بە یەکگەیشتنی هێڵی گۆڵ و ناوچەی سزا بێت و یاریدەدەری داوەر دەبێت لە یەك ئاستا بێت لەگەڵ نیشانەی لێدانی سزا (کە هێڵی ئۆفسایدە).**



**بەرەنگاربوونەوەی بە كۆمەڵ (ڕووبەڕوو بونەوەی بە كۆمەڵ) (Mass confrontation):**

**لە حاڵەتی بەرەنگاربوونەوەی بە كۆمەڵ، یاریدەدەری داوەری نزیك دێتە نێو یاریگا بۆ یارمەتیدانی داوەر. یاریدەدەرەكەی تر چاودێری و وردەكاری ڕووداوەكە تۆمار دەكات. داوەری چوارەم دەبێت بمێنێتەوە لە دەورووبەری هەردوو ناوچەی هونەری.**



**ماوەی پێویست (Required distance):**

**كاتێ ئاماژە دەكرێت بە لێدانی ئازاد (لێدانی ڕاستەوخۆ وناڕاستەوخۆ) زۆر نزیك لە یاریدەدەری داوەر ئەوا لەوانەیە یاریدەدەری داوەر بێتە نێو یاریگا (زۆربەی كات بە داوای داوەر) بۆ یارمەتیدان ودڵنیابوون لەوەی كە یاریزانان ماوەی 9.15 م لە تۆپەوە دوورن. لەم حاڵەتەدا دەبێت داوەر چاوەڕوان بێت هەتا یاریدەدەری داوەر دەگەڕێتەوە شوێنی خۆی پێش دەستپێكردنەوەی یاری.**

**كاری ئاڵوگۆڕین (Substitution):**

**ئەگەر داوەری چوارەم ئامادە نەبوو ئەوا یاریدەدەری داوەر دەجوڵێت بەروە هێڵی ناوەڕاست بۆ یارمەتیدانی كاری ئاڵوگۆڕین: دەبێت داوەر چاوەڕوان بێت هەتا یاریدەدەری داوەر دەگەڕێتەوە شوێنی خۆی پێش دەستپێكردنەوەی یاری.**

**ئەگەر داوەری چوارەم ئامادە بوو ئەوا پێویست ناكات یاریدەدەری داوەر بجوڵێت بەرەو هێڵی ناوەڕاست چونكە داوەری چوارەم هەڵدەستێت بە كاری ئاڵوگۆڕین مەگەر چەند یاریزانێك ئاڵوگۆڕ بكرێت لە هەمان كاتدا لەم حاڵەتە یاریدەدەری داوەر دەجوڵێت بەروە هێڵی ناوەڕاست بۆ یارمەتیدانی داوەری چوارەم.**

## زمانی جەستە و پەیوەندی وفیکە (Body Language, Communication and Whistle):

### 1. داوەران (Referees):

### زمانی جەستە (Body language):

زمانی جەستە ئامرازێکە بەکاردەهێنرێت بۆ:

- یارمەتیدان بۆ کۆنترۆڵ کردنی یاری.
- پێشاندانی دەسەڵات وخۆڕاگری.

زمانی جەستە ڕوونکردنەوەی بڕیاری داوەر نیە.

### هێماکان (نیشانەکان) (Signals):

سەیری بەندی 5 بکە سەبارەت بە وێنەی هێماکان (نیشانەکان).

### فیکە (Whistle):

فیکە پێویستە بۆ:

- دەستپێکردنی یاری (تایمی یەکەم ودووەمی یاری ئاسایی وکاتی زیادکراو) دوای تۆمارکردنی گۆڵ.
- وەستانی یاری:
  - بۆ لێدانی ڕاستەوخۆ وناڕاستەوخۆ یان لێدانی سزا.
  - ئەگەر یارییەکە هەڵپەسێردراو کرا (تەواونەکرا).
  - لە کاتی کۆتایی هێنانی هەر تایمێك.
- دەستپێکردنەوەی یاری بۆ:
  - لێدانی راستەوخۆ وناڕاستەوخۆ کاتێ پێویست بە ماوەی دیاریکراو بکات لە کاتی ڕێکخستنی دیوار.
  - لێدانی سزا.
- دەستپێکردنەوەی یاری پاش ئەوەی یاری وەستێنرا بۆ:
  - پێدانی کارتی زەرد یان سوور.
  - پێکانی یاریزان.
  - کاری ئاڵوگۆڕین.

فیکە پێویست ناکات بۆ:

- وەستانی یاری بۆ حاڵەتێکی ڕوونی:
  - لێدانی گۆڵ یان لێدانی گۆشە یان هەڵدانی تەنیشت یان تۆمارکردنی گۆڵ.

- دەستپێکردنەوەی یاری لە:
  - زۆربەی لێدانەکانی ڕاستەوخۆ وناڕاستەوخۆ ولێدانی گۆڵ یان لێدانی گۆشە یان هەڵدانی تەنیشت یان بەردانەوەی تۆپ.

بەکارهێنانی فیکە بە شێوەیەکی زۆر وناپێویست ئەوا کەمترین کاریگەری دەبێت لە کاتی پێویستدا.

ئەگەر داوەر داوای لە یاریزان (یاریزانان) کرد کە چاوەڕوانی فیکەی داوەر بن پێش دەستپێکردنەوەی یاری (بۆ نموونە: هەڵدەستێت بە دڵنیابوون لەوەی کە یاریزانانی بەرگری ماوەی 9.15 م دوورن لە کاتی لێدانی ئازاد) ئەوا دەبێت داوەر بە شێوەیەکی ڕوون وئاشکرا ئاماژە بدات بە یاریزانانی هێرشبەر کە چاوەڕوانی فیکەی داوەر بن.

ئەگەر داوەر بە هەڵە فیکەی لێدا ویاری وەستێنرا ئەوا یاری دەستپێدەکاتەوە بە بەردانەوەی تۆپ.

2. یاریدەدەرانی داوەر (Assistant referees):

نیشانەی (هێمای) وریاکردنەوە (Beep signal):

نیشانەی وریاکردنەوە هێمایەکی زیادەیە بەکار دێت تەنها بۆ ڕاکێشانی سەرنجی داوەر.

ئەو حاڵەتانەی کە هێمای وریاکردنەوە لەوانەیە بە سوود بێت ئەوونەش بریتین:

- ئۆفساید.
- سەرپێچییەکان (لە دەرەوەی بینینی داوەر).
- هەڵدانی تەنیشت یان لێدانی گۆشە یان لێدانی گۆڵ یان گۆڵ (کاتێ بڕیارییەکی وورد و کۆتایی بێت).

سیستەمی پەیوەندی ئەلیکترۆنی (Electronic communication system):

کاتێ سیستەمی پەیوەندی ئەلیکترۆنی بەکار دەهێنرێت ئەوا داوەر هەڵدەستێت بە پێدانی ئامۆژگاری بە یاریدەدەرانی داوەر کە کەی باش وگونجاوە سیستەمی پەیوەندی بەکاربهێنن یان لە جیاتی هێمای جەستەیی.

تەکنیکی ئاڵا (Flag technique):

ئاڵای یاریدەدەری داوەر هەمیشە دەبێت ڕوون بێت و لوول نەکراوبێت بۆ داوەر. ئەمەش مانای ئەوەیە هەمیشە دەبێت ئاڵاکە بەو دەستە هەڵبگرێت کە نزیکە بۆ داوەر. لە کاتی پێدانی نیشانە ئەوا دەبێت یاریدەدەری داوەر بوەستێت لە ڕاکردن و ڕوو بکاتە یاریگا، وهەڵدەستێت بە پەیوەندی چاو لەگەڵ داوەر وبەرزکردنەوەی ئاڵاکەی بە جوڵەیکی ئەنقەست (نە زۆر بە پەلە یان نە زیادە ڕەوی پێوە بێت).

ئاڵاکە دەبێت بەرێکی درێژایی دەستی بێت. یاریدەدەری داوەر دەبێت ئاڵاکەی بەرز بکاتەوە بەو دەستەی کە بەکاردێنێت بۆ نیشانەی داهاتوو. وئەگەر بارودۆخی یارییەکە گۆڕاو وپێویستی بە بەکارهێنانی دەستەکەی تر بوو بۆ ئاماژەی (نیشانەی) داهاتوو ئەوا دەبێت یاریدەدەری داوەر ئاڵاکەی بگوازێتەوە بۆ دەستەکەی تری لە خوار کەمەرەوە. ئەگەر یاریدەدەری داوەر ئاماژەی دا بەوەی تۆپ لە دەرەوەی یارییە ئەوا دەبێت یاریدەدەری داوەر نیشانەکەی ڕابگرێت هەتا داوەر ئاگای لێ دەبێت.

ئەگەر یاریدەدەری داوەر ئاماژەی دا بە سەرپێچی دەرکردن (بە کارتی سوور) وئاماژەکەی (نیشانەکەی) یەکسەر نەبینرا:

- ئەگەر یارییەکە وەستا ئەوا دەستپێکردنەوەی یاری لەوانەیە بگۆڕدرێت بەپێی یاسا یاری (لێدانی ئازاد یان لێدانی سزا.....هتد).
- ئەگەر یاری دەستی پێکردەوە، ئەوا هێشتا داوەر لەوانەیە کاری سەرزەنشتی جێبەجێ بکات، بەڵام سەرپێچییەکە سزا نادرێت بە لێدانی ئازاد یان لێدانی سزا.

### نیشانە (جوڵەی دەست) (Gestures):

وەکو بنەمایەکی گشتی نابێت یاریدەدەری داوەر نیشانەیەکی دەستی ئاشکرا بدات. لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێ حاڵەتدا نیشانەی دەستی نهێنی لەوانەیە یارمەتیدەر بێت بۆ داوەر. دەبێت نیشانەی دەستی مەبەستێکی ڕوونی هەبێت ئەوەش دەبێت ڕەزامەندی لەسەر کرابێت لە گفتوگۆی پێش دەستپێکردنی یاری.

### هێماکان (نیشانەکان) (Signals):

سەیری بەندی 6 بکە سەبارەت بە وێنەی هێماکان (نیشانەکان).



### لێدانی گۆشە / لێدانی گۆڵ (ماڵی گۆڵ) (Corner kick / goal kick):

کاتێ تۆپ بە تەواوەتی وبە هەموو قەبارەیەوە تێ دەپەڕێت بەسەر هێڵی گۆڵی نزیك بە یاریدەدەری داوەر ئەوا دەبێت ئاماژە (نیشانە) بدات بە دەستی ڕاست (کە باشترین هێڵە بۆ بینین) بۆ ئاماژەدان بەوەی ئایا لێدانی گۆڵە یان لێدانی گۆشەیە.

کاتێ تۆپ بە تەواوەتی وبە هەموو قەبارەیەوە تێ دەپەڕێت بەسەر هێڵی گۆڵ ئەوا دەبێت یاریدەدەری داوەر ئاڵاکەی بەرز بکاتەوە بۆ ئاگادارکردنەوەی داوەر کە تۆپەکە چۆتە دەرەوەی یاری وپاشان ئەگەر:

- حاڵەتەکە نزیك بوو لە یاریدەدەری داوەر– ئەوا ئاماژە دەدات بە لێدانی گۆڵ یان لێدانی گۆشە.
- حاڵەتەکە دوور بوو لە یاریدەدەری داوەر– ئەوا هەڵدەستێت بە پەیوەندی چاو لەگەڵ داوەر و پاشان شوێنی بڕیاری داوەر دەکەوێت. هەروەها لەوانەیە یاریدەدەری داوەر یەکسەر ئاماژە بدات ئەگەر بڕیارەکە ڕوون وئاشکرا بوو.

### هەڵەکان (Fouls):

دەبێت یاریدەدەری داوەر ئاڵاکەی بەرز بکاتەوە کاتێك هەڵەیەك یان بەد ڕەفتارییەك ڕوو دەدات لە دەوروپشتی نزیك خۆی یان لە دەرەوەی بینینی داوەر. لە هەموو کاتەکانی تردا یاریدەدەری داوەر دەبێت چاوەڕوانی بکات وبۆچوونی خۆی بدات ئەگەر پێویست بکات وپاشان ئاگاداری داوەر بکاتەوە لەوەی بینیوێتی وبیستوویەتی وکام یاریزانانە بەشداری سەرپێچییەکەی کردووە.

پێش ئەوەی ئاماژە بە سەرپێچی بکات ئەوا یاریدەدەری داوەر دەبێت ئەمانە لەبەرچاو بگرێت:

- سەرپێچیەکە لە دەرەوەی بینینی داوەر بوو یان بینینی داوەر داپۆشرا بوو.
- داوەر یاسای سوود بەخشی بەکار نەهێنا.

کاتێ هەڵەیەك یان سەرپێچییەك ڕوو دەدات کە پێویست دەکات یاریدەدەری داوەر ئاماژە بدات ئەوا یاریدەدەری داوەر دەبێت هەستێت بە:

- بەرز کردنەوەی ئاڵاکەی بە هەمان دەست کە بەکاردەهێنرێت بۆ ئەو نیشانەی کە ماوەتەوە (واتە هەمان دەست بەکاردێت بۆ تەواوکردنی نیشانەکەی تر)، ئەمە ئاماژەیەکی ڕوون دەداتە داوەر بۆ ئەوەی کێ لێدانی ئازاد (ڕاستەوخۆ وناڕاستەوخۆ) جێبەجێ دەکات.
- پەیوەندی چاو لەگەڵ داوەر.
- ئاڵاکەی ڕاوەشانێك یان شەپۆلێکی کەمی دەداتێ بەملا و ئەولا (خۆ بەدوور گرتن لە هەر جوڵەیەکی ڕادەبەدەر یان شەڕانی).

دەبێت یاریدەدەری داوەر هەستێت بە بەکارهێنانی (تەکنیکی چاوەڕوانی وسەیرکردن) بۆ ڕێگەدان بە بەردەوام بوونی یاری ونابێت ئاڵاکەی بەرز بکاتەوە کاتێك ئەو تیپەی کە سەرپێچی لە دژی ئەنجامدراوە سوود وەردەگرێت لە یاسای سوود بەخش؛ بۆیە زۆر گرنگە یاریدەدەری داوەر هەستێت بە پەیوەندی چاو لەگەڵ داوەر.

**هەڵەكان لە نێو ناوچەی سزا (Fouls inside the penalty area):**

لە كاتی ڕوودانی هەڵەیەك لەلایەن یاریزانی بەرگری لە نێو ناوچەی سزا ولە دەرەوەی بینینی داوەر، وبە تایبەتی نزیك شوێنی یاریدەدەری داوەر ئەوا دەبێت یاریدەدەری داوەر یەكەم كار هەستێت بە پەیوەندی چاو لەگەڵ داوەر بۆ ئەوەی ببینێت داوەر لە چی شوێنێكە وچی كارێك دەگرێتە بەر. ئەگەر هاتوو داوەر هیچ كارێكی نەگرتە بەر، ئەوا دەبێت یاریدەدەری داوەر ئاماژە بدات بە ئاڵاكەی وهەستێت بە بەكارهێنانی سیستەمی ووریاكردنەوەی ئەلیكترۆنی وپاشان جوڵاندنەوە بە ڕوونی بە درێژایی هێڵی تەنیشت بەرەو ئاڵای گۆشە.

**هەڵەكان لە دەرەوەی ناوچەی سزا (Fouls outside the penalty area):**

لە كاتی ڕوودانی هەڵەیەك لەلایەن یاریزانی بەرگری لە دەرەوەی ناوچەی سزا (نزیك سنووری ناوچەی سزا) ئەوا دەبێت یاریدەدەری داوەر هەستێت بە پەیوەندی چاو لەگەڵ داوەر بۆ ئەوەی ببینێت داوەر لە چی شوێنێكە وچی كارێك دەگرێتە بەر، وئاماژە بدات بە ئاڵاكەی ئەگەر پێویستی كرد. لە حاڵەتی هێرشی هەڵگەڕاوە دەبێت یاریدەدەری داوەر توانای پێدانی زانیاری هەبێت وەكو: هەڵە ڕوویداوە یان ڕووی نەداوە، یان هەڵەكە لە نێو یان لە دەرەوەی ناوچەی سزا ڕوویداوە و چی كارێكی سەرزەنشتی دەبێت بگرێتە بەر. دەبێت یاریدەدەری داوەر بجولێت بە ڕوونی بە درێژایی هێڵی تەنیشت بەرەو هێڵی ناوەڕاست بۆ ئاماژەدان بەوەی كە سەرپێچییەكە لە دەرەوەی ناوچەی سزا ڕوویداوە.

**حاڵەتەكانی گۆڵە/ گۆڵ نیە (Goal/no goal):**

كاتێ تۆپ بە ڕوونی تێ دەپەڕێت بە هەموو قەبارەیەوە بەسەر هێڵی گۆڵ بۆ نێو گۆڵ ئەوا دەبێت یاریدەدەری داوەر هەستێت بە پەیوەندی چاو لەگەڵ داوەر بەبێ ئەوەی هیچ نیشانەیەكی (هێمایەكی) زیادە بدات.

كاتێك گۆڵ تۆمار دەكرێت بەڵام ڕوون نیە داخوا تۆپەكە تێ پەڕیووە بەسەر هێڵی گۆڵ، ئەوا دەبێت یاریدەدەری داوەر یەكەم كار هەستێت بە بەرزكردنەوەی ئاڵاكەی بۆ ڕاكێشانی سەرنجی داوەر وپاشان گۆڵەكە دڵنیا (دوویات) دەكاتەوە.

**ئۆفساید (Offside):**

یەكەم كار كە یاریدەدەری داوەر پێی هەڵدەستێت دوای بڕیاری ئۆفساید بەرزكردنەوەی ئاڵاكەیەتی (بەكارهێنانی دەستی ڕاست باشترین هێڵی بینین دەبەخشێت) وپاشان ئەگەر داوەر یاری وەستاند ئەوا بە ئاڵاكەی ئاماژە بە شوێنی ڕوودانی سەرپێچیەكە دەكات لە نێو یاریگادا.

ئەگەر داوەر یەكسەر ئاڵاكەی نەبینی ئەوا پێویستە یاریدەدەری داوەر هێماكەی ڕا بگرێت هەتا داوەر دەیبینێ وئاگادار دەبێت یان تیپی بەرگری كۆنترۆڵی تۆپ دەكات بە شێوەیەكی ئاشكرا.

**لێدانی سزا (Penalty kick):**

ئەگەر گۆڵپارێز جوڵا بە ڕوونی لەسەر هێڵی گۆڵ بۆ پێشەوە پێش ئەوەی لە تۆپ بدرێت وگۆڵ تۆمار نەكرا ئەوا دەبێت یاریدەدەری داوەر ئاڵاكەی بەرز بكاتەوە.

**كاری ئاڵوگۆڕین (Substitution):**

كاتێك یاریدەدەری داوەر ئاگادار دەكرێتەوە (لەلایەن داوەری چوارەم یان كارگێری تیپ) كە داوای ئاڵوگۆڕین هەیە ئەوا دەبێت یاریدەدەری داوەر ئاماژە بدات بە داوەر لەگەڵ یەكەم وەستانی داهاتووی یاری.

### هەڵدانی تەنیشت (Throw-in):

کاتێ تۆپ بە هەموو قەبارەیەوە تێ دەپەڕێ بەسەر هێڵی تەنیشت:

- نزیك بوو لە یاریدەدەری داوەر– ئەوا دەبێت هێمایەکی یەکسەر بدات بۆ دیاریکردنی ئاڕاستەی هەڵدانی تەنیشت.
- دوور بوو لە یاریدەدەری داوەر وبڕیاری هەڵدانی تەنیشت ڕوون بوو – ئەوا دەبێت یاریدەدەری داوەر هێمایەکی یەکسەر بدات بۆ دیاریکردنی ئاڕاستەی هەڵدانی تەنیشت.
- دوور بوو لە یاریدەدەری داوەر و یاریدەدەری داوەر گوًمانی هەبوو دەربارەی ئاڕاستەی هەڵدانی تەنیشت – ئەوا دەبێت یاریدەدەری داوەر ئاڵاکەی بەرز بکاتەوە بۆ ئاگادار کردنەوەی داوەر کە تۆپ لە دەرەوەی یارییە وهەڵدەستێت بە پەیوەندی چاو لەگەڵ داوەر و پاشان شوێنی نیشانەی (بڕیاری) داوەر دەکەوێت.

### 3. یاریدەدەرانی داوەری زیادە (Additional assistant referees):

یاریدەدەرانی داوەری زیادە هەڵدەستن بە بەکارهێنانی سیستەمی پەیوەندیی ڕادیۆ (بەبێ ئاڵا) بۆ پەیوەندی کردن لەگەڵ داوەر. ئەگەر سیستەمی پەیوەندیی ڕادیۆ لە ئیش کەوت (لە کار کەوت) ئەوا یاریدەدەرانی داوەری زیادە هەڵدەستن بە بەکارهێنانی نیشانەی وورریاکردنەوەی ئەلیکترۆنی (داری ئاڵای ئەلیکترۆنی). زۆربەی کات یاریدەدەرانی داوەری زیادە نیشانەی ئاشکرا و ڕوون بە دەست بەکار ناهێنن، بەلاَم لە هەندێك حاڵەتدا نیشانەیەکی دەستی نهێنی لەوانەیە پاڵپشتێکی باش بێت بۆ داوەر. دەبێت هێمای (نیشانەی) دەستی مەبەستێکی ڕوونی هەبێت وئەم نیشانەیە دەبێت ڕەزامەندی لەسەر کرابێت لە گفتوگۆی پێش دەستپێکردنی یاری.

بۆ هەڵسەنگاندنی تێ پەڕاندنی تۆپ بە هەموو قەبارەیەوە بەسەر هێڵی گۆڵ بۆ ناو گۆڵ، ئەوا دەبێت یاریدەدەرانی داوەری زیادە:

- یەکسەر داوەر ئاگادار بکاتەوە بەڕێی سیستەمی پەیوندی کە پێویستە گۆڵەکە ئەژمار بکرێت.
- پێدانی نیشانەیەکی ڕوون بە دەستی چەپی بە شێوەیەکی ستوونی لەسەر هێڵی گۆڵ بە ئاماژەدان بەرەو ناوەڕاستی یاریگا (هەروەها پێویستە داری ئاڵای ئەلیکترۆنی بە دەستی چەپی بێت). پێویست بەم نیشانەیە ناکات کاتێ تۆپەکە زۆر بە ڕوونی تێ پەڕی بەسەر هێڵی گۆڵ.

داوەر بڕیاری کۆتایی دەدات.

ئامۆگاری تر (Other advice):

1. یاسای سوود بەخش (Advantage):

داوەر بواری یاسای سوود بەخش دەدات لە كاتی ڕوودانی هەڵەیەك یان سەرپێچیەك بەڵام دەبێت ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بكرێت لە كاتی بڕیاری جێبەجێكردنی یاسای سوود بەخش یان وەستانی یاری:

- توندی سەرپێچیەكە: ئەگەر سەرپێچیەكە پێویستی بە دەركردن بوو (بە كارتی سوور)، ئەوا دەبێت داوەر یاری بوەستێنێت وئەو یاریزانە دەربكات (بە كارتی سوور) مەگەر هەلێكی مسۆگەر هەبێت بۆ گۆڵ كردن.
- شوێنی ئەنجامدانی سەرپێچیەكە: هەرچەندە سەرپێچیەكە نزیك بێت لە گۆڵی بەرامبەر ئەوا یاسای سوود بەخش زۆرترین كاریگەری دەبێت.
- هەلێكی هێرش بردنی ڕاستەوخۆی بە سوود هەبێت لە سەر گۆڵی بەرامبەر.
- كەش وهەوای یارییەكە.

2. پێدانی كاتی بە فیڕۆچوو (Allowance for time lost):

زۆر وەستان لە كاتی یاری كارێكە بە تەواوەتی ئاسایی وسروشتیە (بۆ نموونە: هەڵدانی تەنیشت، لێدانی گۆڵ). وقەرەبووی كاتی بە فیڕۆچوو دەكرێت كاتێك وەستانەكان لە ئەندازە بەدەر بێت.

3. گرتنی یاریزانی بەرامبەر (Holding an opponent):

داوەران بیردەخرێنەوە كە دەستێوەردانیان لە سەرەتاوە بێت ومامەڵەكردن بە وریایی بكەن لە گەڵ سەرپێچی گرتنی یاریزان بە تایبەتی لە نێو ناوچەی سزا لە كاتی لێدانی گۆشە ولێدانی ئازاد (ڕاستەوخۆ وناڕاستەوخۆ). بۆ هەڵس وكەوت كردن لە گەڵ ئەم حاڵەتانە:

- دەبێت داوەر هەستێت بە ئاگا كردنەوەی (هۆشداری) هەر یاریزانێك كە یاریزانی بەرامبەر دەگرێت پێش ئەوەی تۆپ بكەوێتە یارییەوە.
- یاریزان ئاگادار دەكرێتەوە (بە كارتی زەرد) ئەگەر بەردەوام بوو لە گرتنی یاریزانی بەرامبەر پێش ئەوەی تۆپ بكەوێتە یارییەوە.
- بڕیاری لێدانی ڕاستەوخۆ یان لێدانی سزا دەدات و ئەو یاریزانە ئاگادار دەكاتەوە (بە كارتی زەرد) ئەگەر سەرپێچییەكە ڕوویدا كاتێ تۆپ لە یاریدا بوو.

4. ئۆفسایدی (Offside):




هێرشبەری (A) **لە ئۆفسایدایە**، بەڵام دەستوەردان لەگەڵ یاریزانی بەرامبەر ناکات وبەر تۆپ دەکەوێت.
دەبێت یاریدەدەری داوەر ئاڵاکەی بەرز بکاتەوە کاتێ یاریزان **بەر تۆپەکە دەکەوێت**.




هێرشبەری (A) **لە ئۆفسایدایە**، دەستوەردان لەگەڵ یاریزانی بەرامبەر ناکات وبەر توپ ناکەوێت. یاریزان بەر تۆپ نەکەوت بۆیە نابێت سزا بدرێت.




هێرشبەری (A) **لە ئۆفسایدایە** ڕا دەکات بەرەو تۆپ، وهەروەها یاریزانی (B) لە **تیپەکەی خۆی** لە لای تەنیشتەوە ڕا دەکات بەرەو تۆپ ویاری پێدەکات. یاریزان (A) بەر تۆپەکە نەکەوت بۆیە نابێت سزا بدرێت.




هێرشبەری (A) **لە ئۆفسایدایە**، لەوانەیە سزا بدرێت پێش ئەوەی یاری بە تۆپ بکات یان بەر تۆپ بکەوێت، ئەگەر بە بڕوای داوەر یاریزانێکی تیپەکەی خۆی لە تەنیشتەوە هیچ هەلێکی نەبوو بۆ یاریکردن بە تۆپ.




هێرشبەری (1) **لە ئۆفسایدایە** ڕا دەکات **بەرەو تۆپ** وبەر تۆپ ناکەوێت. دەبێت یاریدەدەری داوەر ئاماژە بدات بە **"لێدانی گۆڵ"** "ماڵی گۆڵ"




هێرشبەری (A) **لە ئۆفسایدایە** هەستا بە داپۆشینی هێڵی بینینی گۆڵپارێز بە ڕوونی. دەبێت ئەو یاریزانە سزا بدرێت بە نەهێشتنی یاریزانی بەرامبەر لە یاریکردن یان توانای یاریکردنی هەبێت.




هێرشبەری (A) **لە ئۆفسایدایە** بەڵام هێڵی بینینی گۆڵپارێز ناگرێت بە ڕوونی یان بەرەنگاری بەرامبەر نەبۆتەوە بۆ تۆپ.




هێرشبەری (A) **لە ئۆفسایدایە** ڕادەكات بەرەو تۆپ، بەڵام ڕێگا ناگرێت لە بەرامبەر كە یاری بكات یان تواناى یاریكردنی هەبێت.

هێرشبەری (A) بەرەنگاری بەرامبەر (B) نەبۆتەوە بۆ تۆپ.




هێرشبەری (A) **لە ئۆفسایدایە** ڕادەکات بەرەو تۆپ بۆ ئەوەی ڕێگری لە یاریزانی بەرامبەری (B) بکات کە یاری بە تۆپ بکات یان توانای یاریکردنی هەبێت بەهۆی بەرەنگاربوونەوەی بەرامبەر بۆ تۆپ. هێرشبەری (A) بەرەنگاری بەرامبەر (B) دەبێتەوە لەسەر تۆپ.




هێرشبەری (B) لە **ئۆفساید وەستاوە** کە دەبێت سزا بدرێت لەبەر یاریکردنی بە تۆپ یان بەرکەوتنی ئەو تۆپەی کە دەگەڕێتەوە یان یاری پێدەکرێت لە ئەنجامی رزگارکردنێکی تۆپ بە ئەنقەست لەلایەن گۆڵپارێز کە وەستاو بوو لە ئۆفساید کاتێ یاریزانی هاوڕێی تیپەکەی خۆی دوایین کەس بوو کە بەر تۆپ کەوت یان یاری بە تۆپ کرد.




هێرشبەری (B) لە ئۆفساید وەستاوە کە پێویستە سزا بدرێت لەبەر یاریکردنی بە تۆپ یان بەرکەوتنی ئەو تۆپەی کە دەگەڕێتەوە یان یاری پێدەکرێت لە ئەنجامی رزگارکردنێکی تۆپ بە ئەنقەست لەلایەن یاریزانێکی تیپی بەرگری (C) کە وەستاو بوو لە ئۆفساید کاتێ یاریزانی هاوڕێی تیپەکەی خۆی دوایین کەس بوو کە بەر تۆپ کەوت یان یاری بە تۆپ کرد.




هاوڕێی تیپەکەی خۆی (هێرشبەر) (A) شووت دەکات وبەر گۆڵپارێز دەکەوێت ودەگەڕێتەوە. یاریزانی هێرشبەری هاوڕێی (B) کە وەستاوە لە تەنیشتەوە یاری بە تۆپ دەکات. یاریزانی هێرشبەری (C) لە شوێنی ئۆفساید وەستاوە نابێت سزا بدرێت لە بەر ئەوەی سوودی وەرنەگرتووە لە شوێنەکەی ولەبەر ئەوەی بەر تۆپ نەکەوتووە.




هاوڕێی تیپەکەی خۆی (هێرشبەر) (A) شووت دەکات ودەگەڕێتەوە لە یاریزانی بەرامبەر ودەچێت بۆ یاریزانی هێرشبەری (B) کە دەبێت سزا بدرێت لەبەر یاریکردنی بە تۆپ یان بەرکەوتنی تۆپ چوونکە پێشتر لە ئۆفسایدا بوو.




هێرشبەری (C) **لە ئۆفسایدایە**، دەستێوەردان ناکات لەگەڵ یاریزانی بەرامبەر کاتێ هێرشبەری هاوڕێی (A) هەڵدەستێت بە پێدانی تۆپ بە یاریزانی (B1) کە وەستاوە لە شوێنێك کە ئۆفساید نیە و ڕا دەکات بەرەو گۆڵی بەرامبەر وهەمان یاریزان لە شوێنی (B2) تۆپ دەداتە یاریزانی هاوڕێی (C).

هێرشبەری (C) نابێت سزا بدرێت لە بەر ئەوەی کاتێ تۆپی پێدرا **لە ئۆفسایدا نەبووە.**

5. چارسەركردن/هەڵسەنگاندن پاش ئاگاداركردنەوە (كارتی زەرد) ودەركردن (كارتی سوور):

(Treatment/assessment after a caution/sending-off)

پێشتر ئەو یاریزانەی كە چارەسەری پزیشكی بۆ بكرایە دەبوایە یاریگا بەجێ بهێڵێت پێش دەستپێكردنەوەی یاری. ئەمە دادپەروەری پێوە دیار نەبوو كاتێ یاریزانی بەرامبەر هۆكار بووایە بۆ پێكانەكەی یاریزان لەبەر ئەوەی تیپی سەرپێچیكار سوودێكی زیادەی ژمارەیی دەبێت لە كاتی دەستپێكردنەوەی یاری.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە پێویست بوو بخرێتە كار چونكە زۆرجار یاریزانان پێكانی یاریزان بەكار دەهێنن بە شێوەیەكی ناوەرزشیانە بۆ دواخستنی دەستپێكردنی یاری لەبەر هۆكاری تەكتیكی.

بە مەبەستی هاوسەنگی لە نێوان ئەم دوو حاڵەتە نادادپەروەریە، ئەنجومەنی یاسادانانی نێودەوڵەتی (بۆرد) بڕیاری دا تەنها لەكاتی سەرپێچی جەستەیی كە یاریزانی بەرامبەر ئاگادار دەكرێتەوە (بە كارتی زەرد) یان دەردەكرێت (بە كارتی سوور) ئەوا یاریزانی پێكراو دەتوانێت بە خێرایی هەڵسەنگاندن وچارەسەری بۆ بكرێت ودواتر لە یاریگادا بمێنێتەوە.

وەكو بنەمایەكی گشتی نابێت دواخستن زۆر درێژە بخایەنێت لە ماوەی ئاسایی خۆی لە كاتی هاتنە ژوورەوەی تیمی پزیشكی بۆ هەڵسەنگاندنی پێكانی یاریزان. جیاوازیەكە ئەو خاڵەیە كە داوەر كاتی خۆی داوای لە تیمی پزیشكی ویاریزانی پێكراو دەكرد كە یاریگا بەجێ بهێڵێن ئەوا هەمان خاڵە ئێستا كە دەبێت تیمی پزیشكی یاریگا بەجێ بهێڵێت بەڵام یاریزانی پێكراو دەتوانێت بمێنێتەوە لە یاریگا.

بۆ دڵنیا بوون لەوەی یاریزانی پێكراو دواخستنی دەستپێكردنەوەی یاری درێژ ناكاتەوە یان بەكار ناهێنێت بە شێوەیەكی نادادپەروەری، ئەوا داوەران ئامۆژگاری دەكرێن كە:

- بە ئاگا بن لە بارودۆخی یارییەكە وهەر هۆكارێكی تەكتیكی بۆ دواخستنی دەستپێكردنەوەی یاری.
- یاریزانی پێكراو بە ئاگا بكاتەوە كە ئەگەر پێویستی بە چارەسەری پزیشكی بێت ئەوا دەبێت بە خێرایی بێت.
- ئاماژە بدات بە تیمی پزیشكی (نەك هەڵگری نەقاڵە) وئەگەر بكرێت بیریان بخاتەوە كە دەبێت بە خێرایی چارەسەر پزیشكی بكەن.

كاتێ داوەر بڕیار دەدات كە دەبێت یاری دەست پێبكاتەوە ئەوا یەكێك لەم دووانە پەیرەو دەكرێت:

- تیمی پزیشكی دەبێت یاریگا بەجێ بهێڵێت ویاریزانی پێكراو بمێنێتەوە یان
- یاریزانی پێكراو یاریگا بەجێ بهێڵێت بۆ هەڵسەنگان یان چارەسەركردنی زیاتر (نیشانەی نەقالە لەوانەیە پێویست بكات).

وەكو ڕێنماییەكی گشتی نابێت دەستپێكردنەوەی یاری دوابكەوێت زیاتر لە نزیكەی 20 بۆ 25 چركە پاش ئەوەی هەموو یاریزانان ئامادە دەبن بۆ دەستپێكردنەوەی یاری.

دەبێت داوەر هەموو كاتی بەفیڕۆچوو قەرەبوو بكاتەوە بۆ وەستانەكانی یاری.

سەرچاوەكان (References)

1- يەكێتى ناوەندى تۆپى پێ ى نێودەوڵەتى (FIFA)
WWW.FIFA.COM : Laws of the game 2016-2017

2- (قانون كره القدم 2008 - 2009) : هاوكار سالار احمد

3- (ياساكانى تۆپى پێ ى 2011): هاوكار سالار احمد